# مەلا مەحموودی بایەزیدی
# (١٧٩٩- ١٨٦٠)
# یەکەمین چیرۆکنووس و پەخشاننووسی کورد

تۆژینەوەیەکە لەبارەی سەرهەڵدانی یەکەمین چیرۆکە کوردییەکان
لەنێوان ساڵانی ١٨٥٦ - ١٨٦٠دا

د. فەرهاد پیرباڵ

# MELA MEHMUDI BAYEZIDI

1860- 1799

LES PREMIERES NOUVELLES EN LANGUE KURDE

DR. FERHAD PIRBAL
L UNIVERSITE DE SALADIN- ARBIL

ARBIL: 2000

ED. ARAS

## دەسپێك

ئەم کتێبە، پێش هەموو شتێک، بریتیە لە چەند کەرەستە و تێکستێک کە بە یەکەمین پەخشان و چیرۆکە کوردییەکان دەژمێردرێن لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا: لە نێوان ساڵانی ١٨٥٦ - ١٨٦٠دا، بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو، لەلایەن مەلا مەحموودی بایەزیدی یەوە، لەسەر داخوازیی قونسوڵی ڕووسیا لە ئەرزەڕۆم، ئەلکساندەر ژابا A. JABA، نووسراون.

لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی لە ئەورووپا بووم، بەشێکی ژیانی خۆمم تەرخان کردبوو بۆ پشکنینی کتێبخانە و ئارشیفخانەی پایتەختەکانی ئەورووپا بۆ دۆزینەوەی دەسنووسە کوردییەکان و گەڕان بە دووای ئەو بەڵگەنامە و تێکستە مێژووییانەی پەیوەندییان بە کولتووری نەتەوەکەمەوە هەیە. لە ئەنجامی ئەم گەڕان و پشکنینەمدا چەندین تێکست و دەسنووسی دانسقەم دۆزییەوە کە ساغکردنەوە و بڵاوکردنەوەیان وامان لێدەکەن بە چاوێکی ڕەخنەگرانە بەو بیر و بۆچوونانەدا بچینەوە کە لەبارەی "مێژووی ئەدەبی کوردی" دا نووسراون؛ نەخشەیەکی کرۆنۆلۆژیی نوێ بۆ کەرەستە پەرش و بڵاوەکان دابڕێژین، بەکورتی: هەوڵێکی تازە بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی و بابەتەکانی بدەین.

ئەم کتێبە، کەواتە، هەوڵدانێکی بچووکە لەم بوارەدا. ئەمەش چونکە، دووای خوێندنەوەی ئەم کتێبە، بۆمان دەسەلمێت کە سەرهەڵدانی ژانری (چیرۆک) لە ئەدەبی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ (٥٧) ساڵ پێش ١٩١٣ ؛ ژانری پەخشانیش، بە هەمان شێوە، دەگەڕێتەوە بۆ ١٨٥٦.

ئەم کتێبە، بریتیە لە پێنج بەش:
١- پێشچاوخستنی ژیاننامە و بەرهەمەکانی مەلا مەحموودی بایەزیدی ( ١٧٩٩ - ١٨٦٠)، لەگەڵ کورتەیەکی ژیان و چالاکییەکانی ئەلکساندەر ژابا ( ١٨٠٣-١٨٩٤) کە ڕۆڵێکی گەورەیان هەبووە لە بواری تۆمارکردن و پاراستنی ئەم بەرهەمانەدا.
٢- پێشچاوخستنی دەسنووسی مەم و زین، نووسراوی مەلا مەحموودی بایەزیدی، کە لە ١٨٥٦دا نووسیویەتی و دەبێتە یەکەم چیرۆکی کوردی. دەسنووسەکە ساغکراوەتەوە و خراوەتە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆ، وشە گرانەکانی لێکدراونەتەوە و تۆژینەوەیەکی لەسەر نووسراوە.
٣- پێشچاوخستنی چل چیرۆکی هەمان نووسەر، کە لە ١٨٦٠دا لە پیتەرسبۆرگ، بە تیراژێکی کەم، لەلایەن ئەلکساندەر ژابا، بە تەرجەمەی فەرەنسییەوە، لەگەڵ پێشەکییەک بە پێنووسی پیتەر لێرخ Lerch، بڵاوکراونەتەوە. ئەمەش دەبێتە یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی چاپکراوی کوردی و لە هەمان کاتدا یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی تەرجەمەکراو بۆ زمانێکی بێگانە. چیرۆکەکانمان وەک خۆیان خستوونەتە ڕوو، لەگەڵ تۆژینەوەیەک کە شایستەی ئەم شاکارە بەهادارەی سەدەی نۆزدەهەم بێت.
٤- پاشکۆیەک بۆ پێشچاوخستنی دەقاودەق وتارەکانی دیکەی م.م. بایەزیدی، کە لەگەڵ هەمان چل چیرۆکەکەدا بڵاوکراونەتەوە و دەبنە یەکەمین وتاری ئەدەبی و تۆژینەوەی زمانەوانی بە زمانی کوردی.
بە پێویستمان نەزانی وتارەکان و چل چیرۆکەکە لە کرمانجیی ژوورووەوە وەربگێڕینە سەر کرمانجیی خواروو، یان بیانخەینە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆ، لەبەر دوو هۆ؛ یەکەم: ئەمان دەسنووس نین تا ساغ بکرێنەوە، بەڵکو چاپکراون؛ دووەم: کوردییەکەیان زۆر ڕوون و شیرینە، بەڵگەنامەیەکی زیندووی ڕێنووسی کوردی و زمانی نووسینی ئەوسەردەمن. هیچ کاریشمان بە تەرجەمە فەرەنسییەکانەوە نەبووە، تەنیا سوودوەرگرتن نەبێت لەو پێشەکییانەی کە ژابا بە فەرەنسی نووسیونی.
٥- پاشکۆیەکی دیکە کە بریتیە لە کرۆنۆلۆژیایەک بۆ مێژووی سەرهەڵدان و نەشونمای چیرۆکی کوردی ( ١٨٥٦-١٩٣٩).

لە کۆتاییدا، ئاماژە بۆ ڕاستییەکی مێژوویی دەکەین: یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بە دیالێکتی ژووروو بڵاوکراوەتەوە( ١٨٩٨)، یەکەم شانۆنامەی کوردی دیسان بە دیالێکتی ژووروو بڵاوکراوەتەوە (١٩١٩)، ئێستاش ئەوەتا دەبینین: یەکەم وتار و پەخشانە کوردییەکان و یەکەم چیرۆکە کوردییەکان - ئەوانیش هەر، بە دیالێکتی ژووروو بڵاوکراونەتەوە. ئامانجی ئێمە لە نووسینی ئەم کتێبە ئەوە نیە وەڵامی ئەم دیاردەیە بدەینەوە، بەقەدەر ئەوەی باوەڕ بە خۆمان بهێنین کە بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبیاتی نەتەوەییمان پێویستە لە چوارچێوەی کرمانجیی خواروو یان کوردستانی عیراق دەربچین: لە چوارچێوەیەکی فراوانی کوردستانییەوە لە ئەدەبەکەمان بکۆڵینەوە.

د. فەرهاد پیرباڵ

هەولێر: ٢٠٠٠/٦/٢١

# مەلا مەحموودی بایەزیدی و ئەلکسەندەر ژابا جمکانەی پەخشانی کوردیی سەدەی نۆزدەهەم

مەلا مەحموودی بایەزیدی ( ١٧٩٩ ــ ١٨٦٠)، یەکەم چیرۆکنووس و پێشڕەوی پەخشاننووسانی کوردی سەدەی نۆزدەهەمە. لە سایەی ئەودا، ئەمڕۆ، زیاتر لە نۆزدە دەسنووسی چیرۆک، باسی زمانەوانی و مێژووی کورد ( کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا نووسراون) لە بەردەستی ئێمەدان. ئەم دەسنووسانەی بایەزیدی، بەڕاستی، گەنجینەیەکی فەرامۆشکراوی ئەدەبیاتی کوردیی سەدەی نۆزدەهەمن. راستییەکەشی، بەرهەمەکانی ئەو، کە زۆربەیان بە هاوکاریی کوردناسی رووس، ئەلکساندەر ژابا Alexandre JABA( ١٨٠٣ــ ١٨٩٤) ئەنجام دراون، سێ چارەگی ئەدەبیاتی پەخشانی کوردیی سەدەی نۆزدەهەم پێکدەهێنن.

رۆڵی پێشڕەوانەی بایەزیدی لەوەدا دەردەکەوێ کە ئەو لە سەردەمێکدا دەستی داوەتە نووسین بە زمانی کوردی کە زۆربەی خەڵکی کورد و رۆشنبیران پەخشانیان بە فارسی و عوسمانلی دەنووسی. رۆژهەڵاتناسی سەدەی نۆزدەهەم، لیرخ P. LEARCH لەم بارەوە، گەواهی دەدات و دەڵێ: " کوردەکان لە نامە گۆڕینەوەی نێو خۆیاندا زمانی فارسی بەکاردەهێنن. ١

کوردناسی ناودار م. پ. رۆدنکۆ، لە پێشەکیی عادات و رسووماتنامەی ئەکرادیەدا، لاپەڕە ٤، رێزێکی زۆر لە رۆڵی بەرهەمەکانی بایەزیدی دەنێت و دەڵێ:" دەتوانم بەوپەڕی دڵنیاییەوە بڵێم: گەلی کورد لە پاراستنی گەلێک لایەنی بەنرخی سامانی رووناکبیریدا تا رادەیەکی زۆر قەرزاری مەلا مەحموودی بایەزیدییە. گەر هاریکاریی بایەزیدی و ژابا نەبوایە، تا ئێستاش بەشێکی بەنرخ لە گەنجینەی ئەدەبی کوردیی سەدە ناوەنجییەکان نەدەزانرا". ٢

تەنیا یەک سەرچاوەمان هەیە کە باسی مەلا مەحموودی بایەزیدیی کردووە، ئەویش بریتییە لەو نامەیەی کە رۆژهەڵاتناسی رووس، ژابا، لە ٢٢/ ٩/ ١٨٥٧دا بۆ پ. ژ. ئا، لێرخی رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی ناردووە و لە کتێبەکەی ژابادا بڵاوکراوەتەوە. ٣ پاشان رۆدنکۆی رووسیش لە پێشەکیی " عادات و رسووماتنامەی ئەکرادیە"دا باسێکی لێوە دەکا کە ئەویش هەر لە سەرچاوە بنجییە فەرەنسییەکەی ژابای وەرگرتووە ( ٤). پاشان ئێ. ئێ. ڤاسیلیڤای رووس، لە هەمان سەرچاوەی فەرەنسییەوە لاپەڕەیەکی لەبارەی بایەزیدییەوە نووسیوە ( ٥). ئێمە لێرەدا سوودمان لە سەرچاوە بنجییە فەرەنسییەکە وەرگرتووە.

مەلا مەحموودی بایەزیدی لە ساڵی ١٧٩٩ لە ناوچەی بایەزید لە باکووری رۆژهەڵاتی کوردستانی تورکیا لەدایک بووە. هەر لەوێش دەستی بە خوێندن کردووە، پاشان لە تەورێز فێری فارسی بووە، ئنجا سەرلەنوێ هاتۆتەوە شارەکەی خۆی و بووە بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئایینی ( حوجرە). بایەزیدی، لەگەڵ شکانی بەهلوول پاشای کورد، دووایین میری کورد لە بایەزید، شارەکەی خۆی جێدێڵێ و دەچێتە ئەرزەڕۆم و لەوێ دەبێتە خواجە؛ پایەیەکی بەرز لەناو نووسەر و رۆشنبیرانی ئەوێ داگیردەکا. لە کاتی راپەڕینەکەی بەدرخان پاشای جەزیرە لە ساڵی ١٨٤٦ دژی عوسمانییەکان، مەلامەحموودی بایەزیدی بەرپرسیارییەکی مێژوویی دەکەوێتە ئەستۆ.

شارەزایی بایەزیدی لەبارەی چوار زمانە گرنگەکەی رۆژهەڵاتدا هێندە فراوان بووە کە لەناو نووسەرەکانی شاری ئەرزەڕۆمدا تەنیا روو لە بایەزیدی دەکرا بۆ نووسین بە فارسی یان بۆ وەرگێڕان لە فارسییەوە بۆ تورکی. لە رەوانبێژی و ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسی و تورکیدا شارەزاییەکی بێ وێنەی هەبووە. قورئانناس، مەلایەکی شارەزا، نووسەرێکی بەتوانا بووە. لە نازناوە ئەدەبییەکانی مەلا مەحموودی بایەزیدی: مەحموود ئەفەندی، فەقیر مەحموود ئەفەندی، خواجە مەحموود ئەفەندی.

راستییەکەی، مەلا مەحموودی بایەزیدی لەگەڵ ئەلکساندەر ژابا لە بواری مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا جمکانەی یەکترن، بۆیە ـ بۆ ئەوەی لە بایەزیدی تێبگەین ـ پێویستە شتێک لەبارەی ئەلکساندەر ژاباوە بزانین:

ئەلکساندەر Alexandre ( یان هەندێ جار ناوی لە خۆی ناوە ئۆگەست Auguste ) ژابا، لە ١٥ی ئابی١٨٠٣دا لە پۆڵۆنیا لەدایکبووە. باوکی ئاغا و گونددار بووە. لە ١٨٢٤ دەبێتە وەرگێڕ لە وەزارەت. پاشان زەمالەیەکی خوێندن وەردەگرێت و لە ١٨٢٨ خوێندنی بالا تەواودەکات و لە ساڵی ١٨٣٠ دەبێتە وەرگێڕی زمانی تورکی لە بەشی زمانە رۆژهەڵاتییەکان لە یافا. لە ساڵی ١٨٣٢ دێتە ئەستەمبۆڵ و لە ١٨٣٥ دەچێتە سمێرنا. لە ساڵی ١٨٤٣ بە بڕیاری ئەنجوومەنی سەرۆکایەتیی ئیمپراتۆر دەبێتە سکرتێری دیوانی سەرۆکایەتی. لە ١٨٤٨ دەبێتە کونسوڵی رووسیا لە ئەرزەڕۆم و لەوێ خۆی فێری کوردی دەکا. لە ١٨٥٣ کۆنسولا دادەخرێ، لە ١٨٥٦ دەکرێتەوە و ئەویش دەست بە کارکردن دەکاتەوە.

ئەلکساندەر ژابا پۆڵۆنی و رووسی و تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسی و کەمێک عەرەبی و کوردی و فارسیشی زانیوە. کوردناسی ناودار م. پ. رۆدنکۆ، لە پێشەکیی ( عادات و رسووماتنامەی ئەکرادیە)دا، رۆڵی ژابا روون دەکاتەوە و دەڵێ: " ژابا لە ناوەڕاستی سەدەی رابردوودا، سەرەتای لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردیی سەدەکانی ناوەڕاستی دامەزراند" . هەروەها رۆژهەڵاتناسی رووس، چیخاچیێف، کە لە رێگای لێکۆڵینەوە و دەسنووسەکانی ژاباوە زانیبووی کورد خاوەنی ئەو ئەدەبە رەسەنەیە؛ لەبارەی ئەلکساندەر ژاباوە دەڵێ: " لێکۆڵینەوەکانی ئەم رۆژهەڵاتناسە بەتوانایە لەبەرئەوە هێندە جێگای سەرنجن، چونکە ئەم تاکە کەسێکە کە لەم ڕۆژەدا ئاوا سەرکەوتووانە خەریکی زمانی میللەتێکە، هێندە کەم ناسراوە و هێندەش دێرینە ' .

ئەلکساندەر ژابا ( ١٨٠٣ – ١٨٩٤) ، لە ماوەی سالآنی ١٨٣٦ ـ ١٨٦٩دا قونسولّی رووسی بووە لە ولآتی عوسمانیدا (لە شاری ئەرزەرۆم و ئیزمیر). ژابا لەلایەن ئەکادیمیای بالآی زانستیی سانت پێترسبۆرگەوە لە رووسیا داخوازیی لێدەکرێ کە کۆمەڵێک دەسنووسی کوردی کۆبکاتەوە و چەند لێکۆڵینەوەیەک لەسەر کولتوور و زمان و ئەدەبیاتی کوردی بنووسێ. بۆ ئەم مەبەستە، ئەلکساندەر ژابا ( ١٨٠٣ـ ١٨٩٤) لە سەرەتای سالّی ١٨٥٦ بەملاوە کۆمەڵێک مەلا و فەقێ و میرزا ( خوێندەوارانی ئەو سەردەمە) لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە. مەلا مەحموودی بایەزیدی یەکێک بووە لەو مەلایانەی کە بوونەتە هاوڕێی هەرە نزیکی ئەو. لەو ماوەیەدا مەلا مەحموودی بایەزیدی نیشتەجێی شاری ئەرزەڕۆم بووە. ئیتر بایەزیدی، لە ١٨٥٦ بەملاوە، بۆتە سکرتێر و هاوکار و راوێژکارێکی تایبەتیی ژابا بۆ کاروباری نووسین و ئەدەبیات و رۆشنبیریی کوردی ( ٦).

م.م. بایەزیدی زۆربەی جاران ناوی خۆی لەسەر ئەو دەسنووس و کتێبانە تۆمار نەدەکرد کە بە هاوکاری لەگەڵ ئەلکساندەر ژابا بلآوی دەکردنەوە، تەنانەت ناوی خۆی لەسەر بەرهەمەکانی خۆێشی تۆمار نەدەکرد: بەرهەمەکان تەنیا بە ناوی ئەلکساندەر ژاباوە تۆماردەکران.

هۆی ئەوەیش کە بایەزیدی ناوی خۆی لەسەر بەرهەمەکانی خۆی نەنووسیوە و تەنیا جار بە جار نازناوی جۆراوجۆری بەکارهێناوە، لە ترسی ئەوە بووە کە بۆ مەلایەکی وەکو ئەو " کارێکی بەجێ " نەبووە لە یەکێکی وەکو ژابای ناموسڵمان نزیک ببێتەوە و هەرەوەزیی لەگەڵدا بکا. مووسایلیان لەم بارەیەوە دەڵێ: " بایەزیدی بە ناوی حاجی مەحموود ئەفەندییەوە کاری دەکرد بۆئەوەی پیاوە ئاینییە ئیسلامییەکان لە خۆی نەورووژێنێ و زویریان نەکات، کە بێگومان دەبوو بە چاوی تانووت و نارەزاییەوە سەیری موسڵمانێک بکەن کە سەرباری هەموو شتێکیش مەلایە و کەچی خەریکی شت نووسین و وەرگێڕانە لەسەر داخوازیی کابرایەکی غەیرە موسڵمان " ( ٧).

ژابا ـ خۆیشی لە پێشەکییە فەرەنسییەکەی عادات و رسوومatنامەکەیدا هۆی ئەم دیاردەیەی بە هەمان شێوە روون کردۆتەوە و دەڵێ کە بایەزیدی نەیویستووە ناوی خۆی بەسەر نووسین و هاوکارییەکانییەوە بێت. ( ٨)

رۆدنکۆ دەڵێ: " ژابا لە زۆربەی تەرجەمەکاندا واتا کوردییەکانی بەڕاستی و بەتەواوەتی وەرنەگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی " ، " لەوە دەچێ بۆیان گێرابێتەوە و ژابا وەری گێڕابێ" ( ٩). ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێ کە مەلا مەحموود تەنانەت لە تەرجەمەکردن بۆ سەر زمانی فەرەنسیش یارمەتیی ژابای داوە. ـ بێگومان لەو ئاستانەی کە پەیوەندییان بە زمانی کوردییەوە هەبووبێ.

دەسنووس و کتێبەکانی مەلا مەحموودی بایەزیدی، هەمیشە، بە دوو زمان ( کوردی و فەرەنسی) بوونە. بەشە کوردییەکان بە پێنووسی بایەزیدی نووسراون. بەشە فەرەنسییەکانیش، ئاشکرایە، دەبێ کە ژابا بە هاوکاریی بایەزیدی تەرجەمەی سەر زمانی فەرەنسیی کردبن. بەڵگەی ئەم یارمەتی و رێبەرایەتییەی بایەزیدی بۆ ژابا، لەم قسەیەی کوردناسی رووس، مووسایلیان دا دەردەکەوێ کە دەڵێ: " مەلا مەحموود مامۆستایەکی لێهاتووی ژابا بوو، هەروەها یاریدەدەرێکی شێلگیرانەی ئەو بوو". ( ١٠)

ژابا لە نامەیەکدا کە بۆ رۆژهەڵاتناسی رووس، دۆرن، نووسیویە، دەڵێ: " من بە رادەیەکی ئەوتۆ زمانی کوردیم خوێندووە و فێری بووم کە بتوانم خۆم خەریکی کارکردن و وەرگێڕان بم " ( ١١). ئەم قسەیەی ژابا نیشانەی ئەوەیە کە ژابا کوردیی زانیوە، بەڵآم زانینەکەی تا ئەو رادەیە نەبووە کە بەتەواوەتی دەسەڵآتی بەسەر کوردیدا بشکێت و پێویستیی بە بایەزیدی نەمێنێ. چونکە جگە لە بایەزیدی مەلای کوردی دیکەش یارمەتیی ژابایان داوە بۆ نووسینەوەی بابەتە کوردییەکان، لەوانە: شێخ نزار (گۆرانی و هەندێ دەسنووسی تری نووسیوە)؛ مەلا مستەفا ( شێخی سەنعان و زەمبیلفرۆشی نووسیوە)؛ مەلا مووسای هەکاری ( لە زمانی فارسییەوە کاری بۆ کردووە)؛ موحەمەد حاریب ئیبن سلێمان ( مەم و زینی نووسیوەتەوە)؛ فەیرووز ئەفەندی، موحەمەد موکسی، تەهای حاجی عەبدولعەزیز، حەسەنی حەکیم باشێ، تاهیری ئیبن عەباس ئەفەندی و فەیزوللا و کەسان تریش( ١٢).

مەلا مەحموودی بایەزیدی، لە ماوەی سالآنی ١٨٥٦ تاکو ١٨٦٩دا، لە چوار ئاستی جۆراوجۆردا یارمەتیی ژابای داوە و هاوکاریی کردووە:

١ـ نووسینەوە.

نووسینەوەی تێکست ( بە زمانەکانی تورکی، فارسی، عەرەبی، کوردی)، واتە کاری سکرتێری. بۆ نموونە: رێزمانە عەرەبییەکەی عەلی تەرەماخی و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق، کە لە سالّی ١٨٥٨دا نووسیبوونییەوە. رۆدنکۆ، لە سالّی ١٩٦١دا، بە زمانی رووسی، لە کتێبی ( ئەو دەسنووسە کوردییانەی لە لینینگراد پارێزراون)، لە لاپەڕە ٤دا ئاماژەی بۆ کردوون ( ١٣).

٢ـ نووسین.

راستەوخۆ تێکستەکانی بە زمانی کوردی یان فارسی نووسیوە و پێشکەش بە ژابای کردوون بۆ چاپ و بلآوکردنەوە. بۆ نموونە: نووسینی چیرۆکی مەم و زین ( لە هاوینی سالّی ١٨٥٦دا)، بە دەستخەتی خۆی، کە پاشان لە لایەن ژاباوە تەرجەمەی فەرەنسی کراوە و لە ئارشیفخانەی ئینالکۆ لە پاریس پاراستوویانە.

٣ـ تەرجەمەکردن

تێکستەکانی بە هەر زمانێکی رۆژهەڵآتی بووبێ تەرجەمەی زمانی دووەم کردووە ( زۆربەی جاران تەرجەمی فارسی). هەندێ جاریش بەپێچەوانەوە، بۆ نموونە تەرجەمەی شەرەفنامەی کردووە بۆ کرمانجی، کە لە مۆسکۆ لە ١٩٨٦دا بلآوکراوەتەوە. یان گەلێک جاران یارمەتیی ژابای داوە بۆ تەرجەمەکردن بۆ سەر زمانی فەرەنسی، بۆ نموونە: ئەو چل چیرۆکەی بە ناونیشانی (جامع رسالیان و حکایتان) تەرجەمەی فەرەنسی کراون و لە ١٨٦٠دا بە کوردی و فەرەنسی بلآوکراونەتەوە( ١٤).

٤ـ هاوکاریکردن لە دانان، بۆ نموونە دانانی قامووسە کوردی ـ فەرەنسیەکەی سالّی ١٨٧٩. ( ١٥).

لە نامەخانەی گشتیی شاری سانت پەترسبۆرگ لە رووسیا، ٥٤ دەسنووس هەن، لەمانە ٤٤ی بە زمانی کوردین، ٤ ی بە فارسین، ٣ ی بە تورکین. هەموو ئەم دەسنووسانە لەلایەن ئەلێکسەندەر ژاباوە ـ بەشێکی زۆریان بە یارمەتی و هاوکاریی مەلا مەحمووددەوە ـ نووسراون و کۆکراونەتەوە. ( ١٦).

مەلا مەحموود کەواتە، دانەر و وەرگێڕی گەلێک لە دەسنووسەکانی ژابایە لە فارسییەوە، بەڵآم بەزۆری ناوی خۆی لەسەر ئەم کار و بەرهەمانەی خۆی تۆمار نەکردووە.

دیاردەی نەنووسینی ناوی خۆ لەلایەن بایەزیدییەوە لەسەر بەرهەم و هاوکارییەکانی خۆی، وای کردووە کە زۆربەی ئەم بەرهەمانەی بایەزیدی ببێتە موڵکی ئەلکساندەر ژابا. ئەمە لە کاتێکدا ئەلکساندەر ژابا ـ گەلێک جاران ـ تەنیا بلآوکەرەوە و وەرگێڕی بەرهەمەکانی بایەزیدییە. ئێمە بۆ روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە و وەدیارخستنی رۆڵی هەر یەکێک لە ژابا و بایەزیدی لەو بەرهەمە هاوبەشانەیاندا لیستێکمان رێکخستووە کە رۆڵی

هەر یەکێکیان بەئاشکرا پیشان دەدات.

بەرهەمەکانی مەلا مەحموودی بایەزیدی

بایەزیدی بە هاوکاریی ژابا، تێروتەسەلترین کۆمەڵە دەسنووسی کوردییان کۆکردۆتەوە کە ٥٧ ناونیشانی جیاوازییان گرتۆتە خۆ(١٧). لە خوارەوەدا لیستەیەکی بەرهەمەکانی بایەزیدی تۆمار دەکەین، کە بریتیە لە زیاتر لە نۆزدە بەرهەم و دەسنووس. بەشی هەرە زۆریان نووسین و بەرهەمی بایەزیدین، بەشە کەمەکەیشی نووسینەوەی هەندێ لە بەرهەمە کلاسیکە کوردییەکانە. بڕێکی کەمیشیان هاوکاریکردنی ژابایە بۆ تەرجەمەکردن یان دانانی کتێب:

١ـ چیرۆکی مەم و زین Legende Kurde ( هاوینی ١٨٥٦)، بەرهەمی خۆیەتی، بە دیالێکتی کرمانجی، بە دەسخەتی خۆی، پاشان لە لایەن ژاباوە خراوەتە سەر ئەلفابیی لاتینی و تەرجەمەی فەرەنسی کراوە، لەگەڵ پێشەکییەک بە زمانی فەرەنسی بە پێنووسی ژابا. چلێکی ئەم دەسنووسە لە کتێبخانەی لانگزۆ Inalco لە پاریس، هەروەها چلێکی تریشی لە نامەخانەیەکی پێترسبۆرگ لە رووسیا، پارێزراون. ئەم دەسنووسە، کە دەبێتە یەکەم چیرۆکی کوردی، لەلایەن نووسەری ئەم چەند دێرە لە پاریس دۆزرایەوە( ١٨).

٢ـ چیرۆکی لەیلا و مەجنوون Legende Kurde ( لە ١٨٥٩دا نووسراوە)، بەرهەمی خۆیەتی، بە دیالێکتی کرمانجی، بە دەسنووسی خۆی. پاشان لەلایەن ژاباوە خراوەتە سەر ئەلفابێی لاتینی و تەرجەمەی فەرەنسی کراوە، لەگەڵ پێشەکییەک بە زمانی فەرەنسی بە پێنووسی ژابا. چلێکی ئەم دەسنووسە، لە کتێبخانەی لانگزۆ لە پاریس، هەروەها چلێکی تریشی لە نامەخانەیەکی پێترسبۆرگ لە رووسیا پارێزراون. ئەم دەسنووسە، کە دەبێتە دووەم چیرۆکی کوردی، لە ئارشیفخانەی پەیمانگەی زمانە رۆژهەڵاتییەکان لە پاریس دۆزیمەوە و لەگەڵ خۆمدا کۆپییەکەیم هێنایەوە بۆ هەولێر بۆئەوەی کاری لەسەر بکەم و بڵاوی بکەمەوە. لە فڕۆکەخانەی ئەنقەرە " لە پایتەختی دیموکراتیەتدا " ئەو دەسنووسە کوردییە دانسقەیان لێم حجز کرد و پاشان لەپێش چاوم، وێڕای بیست و حەوت کەرەستەی دەگمەنی دیکەی کوردی، سووتاندنیان. بەڵام ئەوەی باش بوو کە پێشتر، لە ساڵی ١٩٩٢دا، لە پاریس، چلێکی کۆپێکراوم لەم دەسنووسە پێشکەش بە مامۆستای هێژام، ئۆردیخانی جەلیل، کردبوو بۆئەوەی ئەویش لای خۆی کاری لەسەر بکا.

٣ـ جامع یی رسالیان و حکایتان Recueil de Notices et Recits Kourdes، چل چیرۆکی کوردییە، بەرهەمی خۆیەتی. ئەم بەرهەمە، کە دەبێتە یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی بە کتێب چاپکراو لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا؛ لەلایەن ژاباوە تەرجەمەی فەرەنسی کراوە ، لە ساڵی ١٨٦٠ لە سانت پیترسبۆرگ بە زمانی کوردی و فەرەنسی لەگەڵ پێشەکییەک بە پێنووسی پیتەر لێرخ P. LERCH بڵاوکراوەتەوە. وەک لە پێشەکییەکەدا هاتووە، پیتەر لێرخ ناونیشانە کوردییەکەی بۆ کتێبەکە داناوە: (جامع یی رسالیان و حکایتان). بەشێکی کەمیش لەو کتێبە، لە پێشەوەدا، بریتیە لە سێ وتاری ئەدەبی کە یەکێک لەمانە پێشەکییەکە بۆ دەسنووسەکەی عەلی تەرەماخی کە لە ساڵانی ١٦٠٠دا نووسراوە و م.م. بایەزیدی سەرلەنوێ بە دەسخەتی خۆی نووسیویەتیەوە.

یەکێک لە چیرۆکەکانی ئەم کۆمەڵە چیرۆکە، کە لە لاپەڕە ٩٨ ـ ١٠٢ی کتێبەکەدا بڵاوکراوەتەوە، بریتیە لە چیرۆکی هاوڕێیەتیی نێوان میر محەمەدی میری بایەزید ( لە ساڵی ١٨٠٤دا) لەگەڵ پییێر ـ ئامێدی ژووبێرت Pierre-Amedee JAUBERT ( ١٧٧٩ـ ١٨٤٧)، کە گەڕاڵێکی ناوداری فەرەنسییە و ناپلیۆن ناردبوویە کوردستان. ناوبراو لای میر محەمەدی بایەزیدی بە ئەسیر دەگیرێ و دەخرێتە بەندیخانەوە.

مەلا مەحموودی بایەزیدی، بەهرەی لەم چیرۆکە راستەقینەیە وەرگرتووە و ئەسارەتی ئەم گەڕاڵە فەرەنسییەی لە وڵاتی کورداندا کردووە بە چیرۆکێک؛ لە کتێبی چل چیرۆکەکەی خۆیدا بۆ ئەلکساندەر ژابای نووسیوەتەوە. پییێر ـ ئامێدی ژووبێرت خۆیشی چیرۆکی گەشتنامەکەی خۆی بە ناونیشانی Voyages en Armenie et en Perse faits dans les annee 1805 et 1806 لە ساڵی ١٨٢١دا لە پاریس چاپ و بڵاوکردۆتەوە.

ئەلکساندەر ژابا، بڵاوکەرەوە و وەرگێڕی ئەم چل چیرۆکە کوردییە، لە مانگی مارتی ١٨٥٩دا بۆ رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی، دۆرن، دەنووسێ و دەڵێ: توانیم کۆمەڵێک چیرۆک لە زاری کوردی ناوچە جیاجیاکانی مووش و بەتلیس و وان و بایەزید و قارس و ئەرزەڕۆم و ئەرزەنجان کۆبکەمەوە ( ١٩).

٤ـ چیرۆکی سیامەند و شەمسێ، بە پەخشان. نووسراوی بایەزیدییە و ژابا کردوویەتییە فەرەنسی.

لەبارەی ئەم دەسنووسەوە، رۆژهەڵاتناسی رووس، چیخاچییێف، دەڵێ:" لەنێو ئەو بەڵگەنامانەدا کە چەندین رەفەی کتێبخانەکەی ئەلکساندەر ژابا ( ئەو کونسوڵە زانایەیان) پڕکردبۆوە، داستانی خۆشەویستیی سیامەند و شەمسی مان بەرچاو دەکەوێت. بەڕێز ژابا نەک تەنیا وەرگێڕدراوی کوردی و تا رادەیەک بە شێوازێکی ئەدەبیی داڕێژراوی ئەو داستانەی دامێ، بەڵکو کۆپییەکی جوانی دەقەکەیشی پێبەخشیم و رێگای ئەوەی دامێ کە بیدەم بە ( کۆمەڵەی ئاسیاویی فەرەنسا ) کە بێگومان دڵشاد دەبێت ئەگەر خۆی بە ئاسەوارێکی وا دانسقەی ئەدەبی رۆژهەڵات دەوڵەمەند بکات " ( ٢٠).

چیخاچییێف ئەم دەسنووسە کوردییەی لەگەڵ وەرگێڕدراوە فەرەنسییەکە و نووسینەوەی بە پیتی لاتینی، لەگەڵ پێشەکییەک بە زمانی فەرەنسی لە ساڵی ١٨٥٩دا بڵاوکردۆتەوە. ( ٢١).

٥ـ عادات و رسووماتنامەی طەوایفی ئەکرادیە و ئوسووڵی نیزاماتی کورمانجی. بەرهەمی خۆیەتی، بە دیالێکتی کرمانجی، لە ١٨٥٨ـ ١٨٥٩دا بە خەتی بایەزیدی نووسراوە، لە ساڵی ١٨٦٨یشدا بە خەتی شەهنەزەر ناوێک نووسراوەتەوە. رۆدنکۆ لە ١٩٦٣دا لە مۆسکۆ، وێڕای پێشەکییەک بە رووسی چاپی کردووە. لەلایەن رۆدنکۆ و ژاباوە تەرجەمەی زمانی فەرەنسی و رووسیش کراوە. ئەلکساندەر ژابا دەسنووسی ئەم کتێبەی لە ئارشیفخانەی سالیکۆف شیدرین لە لینینگراد لە رووسیا پاراستووە؛ ئەمە ژمارەکەیەتی: Kurd 7 . ئەم کتێبە لەلایەن د. احمد عثمان ابوبکرەوە تەرجەمەی عەرەبی کراوە( ٢٢). کتێبی ناوبراو یەکەم لێکۆڵینەوەی ئەتنۆگرافی و کۆمەڵناسی و ئەتنۆپۆلۆژییە لەبارەی کورد کە بە زمانی کوردی نووسرابێت.

٦ـ تەرجەمەی کورتەی شەرەفنامەی شەرەفخانی بەتلیسیی بۆ کرمانجی، بە ناونیشانی تەواریخی قەدیمی کوردستان، کە لە ١٨٥٨ـ ١٨٥٩دا کردوویەتی. لە ساڵی ١٩٨٦دا لەلایەن م. ب. رۆدنکۆ، وێڕای پێشەکییەک، لە مۆسکۆ چاپکراوە. ژمارەی دەسنووسەکە لە نامەخانەی سالتیکۆف شدرین، لە لینینگراد: Kurd 37

د. کەمال مەزهەر رێزێکی زۆری لەم تەرجەمەیەی بایەزیدی ناوە و بە فراوانی باسی رۆڵ و توانای مێژوونووسینی مەلا مەحموودی بایەزیدی دەکات( ٢٣).

٧ـ هاوکاری کردن و یارمەتی دانی ژابا بۆ دانانی قامووسێکی کوردی ـ فەرەنسی بە ناونیشانی Dictionnaire Kurde

Francais کە لە ساڵی ١٨٧٩دا لە سانت پیترسبۆرگ بڵاوکراوەتەوە.

٨ـ بەشداریی کردووە لە نووسینەوە و ساغکردنەوەی کتێبە ڕێزمانییەکەی عەلی تەرەماخی ( ڕێزمانی عەرەبی بە زمانی کوردی)، هەروەها پێشەکیشی بۆ نووسیوە. ناونیشانی بنجیی دەسنووسەکە، ئەمەیە: ( صرف و بعضی اصول لازمە یی تعلیمە بە زمانی کورمانجیە). ڕۆڵی سەرەکیی بایەزیدی لەم بەرهەمەدا زیاتر ئەوەبووە کە بەرهەمە بنجییەکەی عەلی تەرەماخیی سەرلەنوێ نووسیوەتەوە. ( ٢٤).

ئەم کتێبەی عەلی تەرەماخی، دیارە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا ( ١٦٠٠) نووسراوە: چونکە مینۆرسکی لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا، کە بە زمانی ئینگلیزی لە ٩٢٧ لە لەندەن چاپکراوە، لە بەرگی دووەم، لە لاپەڕە ١٣٠ـ ١٣٥دا، دەڵێ: " عەلی تەرەماخی لە ١٥٩١دا لەدایک بووە ". پێویستیشە بڵێین: عەلی تەرەماخی بە هەڵە ناوی گۆڕاوە و لە لایەن هەندێ شارەزایانی ئەدەبی کوردییەوە کراوە بە عەلی تەرموکی. ( ٢٥).

ژابا لە دوو نامەدا، کە لە ١٨٥٨/٦/١٧ و لە ١٨٥٩/٤/٢دا ناردوویەتی بۆ ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی لێرنهاردت دۆرن، باسی ئەوە دەکا کە ئەم دەسنووسە دەگمەنە پێش ساڵی ١٨٥٧ لەلای مەلایەکی خەڵکی هەکاری بووە و داوای لێکردووە بیداتێ یان بیفرۆشتێ، نەیفرۆشتووە. پاشان مەلا مەحموودی بایەزیدی ئەم دەسنووسە لە ساڵی ١٨٥٧دا دەنووسێتەوە؛ پێشەکییەکیش لەبارەی ژیانی دینی و ڕۆشنبیریی ناو مزگەوتەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان و شێوازی دەرس خوێندن، لەگەڵ کورتەیەک لەبارەی ژیانی عەلی تەرەماخی دەنووسێتەوە.

ژابا کورتەیەکی بابەتەکەی تەرەماخی و پێشەکییەکەی بایەزیدی، تەرجەمەی فەرەنسی کردووە و لە ١٨٥٨/٦/١٧دا ناردوونی بۆ ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی، لێرنهاردت دۆرن؛ پاشان لە ١٨٥٩/٤/٢دا سەرجەم بابەتەکەی عەلی تەرەماخیی بۆ دەنێرێ کە بە خەتی بایەزیدی نووسراوەتەوە. پاشان لە بەشی پێشەوەی کتێبی ( جامع یی رسالیان و حکایتان)، کە لە ١٨٦٠دا چاپکراوە، ژابا کورتەی ئەو کتێبەی عەلی تەرەماخی بە کوردی و تەرجەمەی فەرەنسییەوە بڵاودەکاتەوە. دەسنووسە بنجییەکەش، کە بە خەتی بایەزیدی نووسراوەتەوە لە کتێبخانەی ئەکادیمیای زانستیی ڕۆژهەڵاتناسیی لینینگراد پارێزراوە ( ٢٦). ناونیشانی دەسنووسەکە بە فەرەنسی ئەمەیە: Gra-maire kurde par Ali Teramakhi offert a l Academie Imperial des Sciences a St-Petersbourg, par A.JABA.

٩ـ تەواریخی جەدیدی کوردستان، یان کیتابی تاریخی جدیدی کوردستان. مەلا مەحموودی بایەزیدی لە ساڵی ١٨٥٧ بەمەلاوە دەستی بە نووسینی کردووە. ویستوویەتی لاسایی شەرەفخانی بەتلیسی بکاتەوە: مێژووی کورد و کوردستان لەو شوێنەوە بنووسێتەوە کە شەرەفخان تێیدا بڕاوەتەوە.

ئەم کتێبەی بایەزیدی نزیکەی هەزار لاپەڕە دەبوو، لە پێشەکییەک و ١١ بەش پێکهاتبوو. ساڵی ١٨٦٥، ژابا ئەم بەرهەمەی کردبووە فەرەنسی، پێشەکیی دەسنووسەکەیشی لە ئەرزەڕۆمەوە بە فەرەنسی ناردبووە کۆڕی زانیاریی ڕووسی بۆ نرخاندنی. بەداخەوە تا ئێستا سەرەنجامی ئەو دەسنووسە نەزانراوە (٢٧).

د. کەمال مەزهەر ئەم هەوڵدانەی بایەزیدیی بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد هەڵسەنگاندووە و ڕۆڵی مێژوونووسینی مەلا مەحموودی بایەزیدیی دەسنیشان کردووە.

بە ڕای د. کەمال مەزهەر، هەستی مێژوونووسیی مەلا مەحموود گەلێک قووڵ بووە (٢٨) .

١٠ـ هاوکاریی کردووە لە دانانی قاموسێکی دیالێکتی هەکاری و ڕەوەندی ـ فەرەنسی لەگەڵ ژابا. هەروەها نووسینی پێشەکییەک بە زمانی کوردی لەبارەی زمانی کوردی. ناونیشانە کوردییەکەی، ئەمەیە: " ئەڤە رسالەیەکە د بەحسا هەنەک فەرق و جودایی دنێڤ لوغاتێد ئەکرادان هەندوو بەیانی بەعزی قەواعیدی عموومی یێد لازمە". بەرگی دەسنووسەکە بە فەرەنسی ئەمەی لەسەر نووسراوە:

Vocabulaire kurde des dialectes de Hekari et Revendi, par A. JABA, Consul de Russie q Erzeroum, Erzeroum le 15 Mars 1858.

واتە: " وشە کوردییەکانی دیالێکتەکانی هەکاری و ڕەوەندی"، لەلایەن: ژابای کونسوڵی ڕووسی لە ئەرزەڕۆم، ئەرزەڕۆم: ١٥ی مارسی ١٨٥٨. بە خەتی شەهنەزەر ناوێک لە ١٨٥٨دا نووسراوە. ٤٩ لاپەڕەیە، ٣٤ بە ٢٢سم، هەر لاپەڕەیەک ١٣ خەتی تێدا نووسراوە. بە خەتی رقعە لەسەر کارتۆنی ئەورووپی بە خەتی ڕەش نووسراوە. کۆدەکەی لە کتێبخانەی ئەکادیمیای ڕۆژهەڵاتناسی لە لینینگراد: D448.

پێشەکییەکی تێدایە بە پێنووسی مەلا مەحموودی بایەزیدی: بە دیالێکتی کرمانجی، باسی هەندێ تایبەتمەندێتیی زمانی کوردی دەکات، ئنجا کورتەیەکی ڕێزمانی لەبارەی دوو دیالێکتەکە و جیاوازییان. دەسنووسەکە لە سێ کێڵگەدا نووسراوە: کرمانجی بە ئەلفبای عەرەبی، کرمانجی بە ئەلفبای لاتینیی کۆن، ئنجا تەرجەمە فەرەنسییەکەیان. بەشی دووەمی دەسنووسەکە قاموسێکە. هەندێ وشەی دوو دیالێکتەکەی هەکاری و ڕەوەندی پێشچاو دەخات و جیاوازییان لەڕووی وشەسازییەوە؛ لە پێنج ستووندا، بەم شێوەیە :

ڕەوەندی بە لاتینی: ڕەوەندی بە عەرەبی: هەکاری بە لاتینی: هەکاری بە عەرەبی: فەرەنسییەکەی.

پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار ئەم دەسنووسە دانسقەیەی ساغکردۆتەوە و لە ساڵی ١٩٨٤دا بڵاوی کردۆتەوە(٢٩).

١١ـ ڕۆدنکۆ لە پێشەکییە ڕووسییەکەی عادات و ڕسووماتنامەکەدا دەڵێ گوایە کتێبێکیشی لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە نووسیوە بە ناونیشانی " رسالەی تحفە النحلان فی الزمان کوردان". ( ٣٠). بایەزیدی ئەم کتێبەی، لە ساڵی ١٨٦٦دا نووسیوە. د. ئەوڕەحمانی حاجی مارفیش ناوی ئەم کتێبەی لە ڕیزی دەسنووسەکانی ژابادا هێناوە (٣١).

١٢ـ یووسف و زلێخا، نووسراوی سەلیمی سلێمان

ساڵی ١٩٧٣ کوردناسی ڕووس، ڕۆدنکۆ نامەی دکتۆراکەی لەسەر یووسف و زلێخای سەلیمی سلێمان بووە ( کۆتایی سەدەی ١٦م ـ سەرەتای سەدەی ١٧م) و لە ١٩٨٥ بڵاوی کردۆتەوە. ئەم دەسنووسە لە ڕیزی دەسنووسەکانی بایەزیدی و ژابا بووە. داستانێکی شیعریی مەسنەوییە، بەرهەمی سەلیمی سلێمانە؛ بایەزیدی نووسیویەتیەوە. لە کۆتایی دەسنووسەکەدا نووسراوە کە سەلیمی سلێمان شاعیری دەرباری میرنشینی کوردستانی تورکیا بووە؛ لە ساڵانی ١٥٨٦ ـ ١٥٨٧دا نووسیویەتی و ١٧١١ بەیتە (٣٢).

١٣ـداستانی قەڵای دمدم

لە کۆمەڵ دەسنووسەکەی ژابادا پۆیەمای قەڵای دمدم هەیە، بەڵام نووسەرەکەی نەناسراوە و نازانین کەی نووسراوە، بەڵام هی سەدەی حەڤدەهەم یا سەرەتای ١٨مە. نموونە: فرمانی عەبداڵخان، کاتێ دەزانی قەڵایان گەمارۆ داوە:

سبحە ڕۆژا شەڕانە ـ بکەنە ئاخر زەمانە
دەست سنگان دانە ـ سەریمد قەبزا خانە.

پاشان:

سواش و قەتڵ و جەنگە    حەسارە پڕ تفەنگە
ژی دبارن بەر سەنگە    هنەک تیر و خەدەنگە
هندی کوو ئەڤ حەسارن    بەرک ژ وان دبارن
عەجەم دبی چارپارن    لەورا دەرخوون دارن
ب خەنجەر هاتن پێکرا    ب هەزاران کوشتن ژێکرا    (٣٣).

ئەم دەسنووسانەی خوارەوەش، د. ئەورەحمانی حاجی مارف بینیونی و لە هەمان سەرچاوەی ناوبراودا باسی کردوون:

١٤ـ ( تەرجەما ضەربی مەثەلانە بزمانی کرمانجی) پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردەوارین، بایەزیدی لە کۆتایی ساڵانی ١٨٥٠دا نووسیوونی و ژابا ڕێکی خستوون و وەریگێڕاون و پێشەکیی بۆ نووسیون. ڕۆدنکۆ، لە ساڵی ١٩٦١دا، بە زمانی ڕووسی، لە کتێبی ( ئەو دەسنووسە کوردییانەی لە لینینگراد پارێزراون)، لە لاپەڕە ٤٤دا ئاماژەی بۆ کردووە (٣٤).

نموونەی چەند پەندێکی ئەو دەسنووسە:

ـ سە درایە، کارولن د بهۆرە
ـ گۆ کەرۆ مەمرە بوهار هات
ـ لنگی خۆ قاس پەردا خۆ درێژکە

هەندێ لە پەندەکانی ئەم دەسنووسە، لەلایەن کوردناسی ڕووس، پ. لێرخ، تەرجەمەی سەر زمانی ئەڵمانی و ڕووسی کراون و لە ١٨٥٧دا چاپکراون. (٣٥).

١٥ ـ لاوێژک.

کۆمەڵێک گۆرانییە کە پیاوان دەیڵێن و زۆربەی بەیتەکانی بە لۆلۆ دەلۆ دەست پێدەکات. بایەزیدی نووسیونی. سەرەتای ئەم دەسنووسە: " لۆلۆ دەلۆ برحی ئەستەنبۆلێ..."؛ کۆتاییەکەی: " من نزانیا شەیتان لەعنەتی لەو بمن کنیایە...".

١٦ـ بریتە

کۆمەڵێک گۆرانیی هەمە چەشنەیە کە لە شایی و هەڵپەڕکێدا دەگوترێ. بایەزیدی نووسیونی. سەرەتای ئەم دەسنووسە: " عەیشۆ من دی بو لبەر)؛ کۆتاییەکەی: " وەرە بگەڤە ناڤ سینگ و بەری عرض دزێ... ".

١٧ ـ حکایات شیخ صنعانیان

چیرۆکە شیعرێکە، نووسراوی فەقێی تەیرانە. سەرەتاکەی: " گوهـ بدێرن نوتقی عاشقانە "؛ " کۆتاییەکەی: دین و سوننەتێ..". " کتاب قصە شیخ صنعانیان" لە ٢٩ی تەمموزی ١٨٦٥ لەلایەن مەلا مەحموودی بایەزیدییەوە ڕوونووس کراوە.

١٨ـ هاوکاریکردنی ژابا لە دانانی فەرهەنگێکی ڕووسی ـ فەرەنسی ـ کوردی و کوردی ـ ڕووسی ـ فەرەنسی.

ژابا، لە ١٨٦٥دا یەکەمین بەشی فەرهەنگە ڕووسی ـ فەرەنسی ـ کوردییەکەی دەنێرێ بۆ ئەکادیمیای ئیمپراتۆری کە بریتی بوو لە ١٥٠٠٠ وشە لە ٧٢١ لاپەڕەدا. بەشی دووەمیشی کوردی ـ ڕووسی ـ فەرەنسییە. ٦٠٠ لاپەڕەیە، لە ١٨٦٩ ـ ١٨٧٢دا نووسراوە. تا ئێستا چاپ نەکراوە و لە ئەکادیمیای زانستەکانی سۆڤییەت لە لینینگراد پارێزراوە.

لێرخ لە پێشوازیی ئەم فەرهەنگەدا ڕای وابوو کە زمانی کوردی ژمارەیەکی زۆرتری دۆست و لایەنگری نوێ وەدەست دێنێ. پاڵ بە گەرۆکە ئەورووپاییەکان لە کوردستاندا دەنێت خۆیان خەریکی فێربوون و لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی بکەن. هەروەها خوێندنەوەی ئەو دەسنووسانەی بڵاوکراونەتەوە و ئەو دەقە کوردییانەی لە ئەرزەڕۆم کۆکراونەتەوە ئاسانتر دەکات و یارمەتیی پێکهاتن و خەمڵاندنی زیاتری زمانی کوردی دەدات (٣٦).

١٩ـ گەلێک بەرهەمی شاعیرانی تورک و عەجەمی تەرجەمەی سەر زمانی کوردی کردووە و بە دەسنووس ماونەتەوە ٣٧.

هەروەها د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف باس لەم بەرهەمانەش دەکا کە بایەزیدی نووسیونەتییەوە: در المجالس، کەلامی کچان، گوری و خلیل بگ، سترانێد کرمانجی، زەنبیل فرۆش، قەولی هەسپی رەش... هتد. جگە لەم بەرهەمانە، لەوانەیە بەرهەمی دیکەشی هەبێت و ئێمە تا ئێستا پێمان نەزانیبێ.

هەموو ئەم دەسنووس و نووسراوانە لە دەزگا زانستییەکانی لینینگراد هەڵگیراون، تایبەت لە کتێبخانەی سەلتیکۆڤ شێدرین. خوالێخۆشبوو م.ب. ڕۆدنکۆ لە کتێبی ( مەجموعەی ئەلکساندەر ژابا ـ دەسنووسە کوردییەکان ـ ، " کارە گشتییەکانی سەلتیکۆڤ شێدرین"، لینینگراد: ١٩٥٧، بەرگی دووەم، ل ١٦٤ـ ١٨٤دا) بە زمانی ڕووسی باسی کردوون (٣٨).

تاکو ئێستا تەنیا بەشێکی کەمی ئەو دەسنووسانەی بایەزیدی ساغ کراونەتەوە: کراونەتە کتێب یان لە شێوەی لێکۆڵینەوە لە گۆڤاراندا بڵاوکراونەتەوە. لەم دەسنووسانە:

١ـ چیرۆکە شیعری مەم و زینی ئەحمەدی خانی، بڵاوکردنەوە و پێشەکیی ڕۆدنکۆ، مۆسکۆ: ١٩٦٢.

٢ـ چیرۆکە شیعری شێخی سەنعان نووسراوی فەقیی تەیران، بڵاوکردنەوە و پێشەکیی ڕۆدنکۆ، مۆسکۆ: ١٩٦٥.

٣ـ چیرۆکە شیعری لەیلا و مەجنوون نووسراوی حارسی بەتلیسی، بڵاوکردنەوە و پێشەکیی ڕۆدنکۆ، مۆسکۆ: ١٩٦٥.

٤ـ عادات و رسوماتنامەی ئەکرادیە، نووسراوی م.م. بایەزیدی، بڵاوکردنەوە و پێشەکیی ڕۆدنکۆ، مۆسکۆ: ١٩٦٣.

٥ـ عەلی تەرەماخی: دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی ( صرف و بعضی اصول لازمە بی تعلیمە بە زمانی کورمانجیە)، بڵاوکردنەوە و پێشەکیی د. مارف خەزنەدار، بەغدا: ١٩٧١.

٦ـ یووسف و زلێخا، نووسراوی سەلیمی سلێمان. ساڵی ١٩٧٣ کوردناسی ڕووس، ڕۆدتکۆ نامەی دکتۆراکەی لەسەر ئەم بابەتە بووە و لە ١٩٨٥ بڵاوی کردۆتەوە.

بەم شێوەیە، مەلا مەحموودی بایەزیدی گەلێک ڕۆڵی گرنگی لە بواری ئەدەبیاتی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا هەبووە. دەتوانین ناوزەدی بکەین بە یەکەم چیرۆکنووس، پێشرەوی پەخشاننووسانی کوردی سەدەی نۆزدەهەم، مێژوونووسێکی وردبین، کۆمەڵناس و ئەتنۆگراف، وەرگێڕ، قاموسەوان، یەکەم ئارشیفیست و کۆکەرەوەی تێکستی فۆلکلۆریی کورد.

لەبارەی ئەلکساندەر ژاباشەوە، بە هەمان شێوە، ئەویش، گەلێک ڕۆڵی گرنگی لە بواری ئەدەبیاتی کوردیی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا هەبووە:

١ـ ئارشیفیست و کۆکەرەوەی دەسنووسی کوردی، بەتایبەتی دەسنووسەکانی بایەزیدی.

٢ـ وەرگێڕێکی بەتوانای پەخشانی کوردیی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، ـ لە کوردییەوە بۆ فەرەنسی.

٣ـ قاموسەوانێکی زرنگ و بەهرەداری کوردی ـ فەرەنسی.

٤ـ هاندەرێکی مەزنی بایەزیدی و نووسەرێکی دڵسۆز بۆ نەتەوەی کورد و کولتوورەکەی.

سەرچاوە:

١: ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە: شێروان مەحموود محەمەد، ڕووناکبیری، ژ ٣ ـ ٤، ستۆکهۆلم: ١٩٩٣، ل ٤١.

٢: د. کەمال مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، ل ١٢٨.

٣: A. JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860.

: Xebat u jiyana Melle Mehmude BEYA-٤ ZIDI, Rojname y Kurdistan Press, Hej 58, Stockholm: 1989.

٥: ئێ. ئێ. ڤاسیلیڤا: دانراوێکی نەزانراو سەبارەت بە مێژووی کوردستان لە " ئاسەوارە نووسراوەکان و کێشەکانی مێژووی کولتووری نەتەوەکانی رۆژهەڵات "، مۆسکۆ: ١٩٦٧، لاپەڕە ٨ ـ ١٠.

٦-

Courier de Smyrna ژمارەی رۆژی ١٠/١/١٨٩٤، لاپەڕە ١.

٧: ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، هـ. س. ، ل ٢٩ ـ ٤٥.

٨: مەلا مەحموودی بایەزیدی: عادات و رسوماتنامەی ئەکردادیە، تێکستەکە خۆی بە کوردییە، بە دیالێکتی کرمانجی، د. شوکریە رەسوول هەڵیگێراوەتە سەر دیالێکتی سۆرانی، بەغدا: ١٩٨٢، ل ١٧.

٩: د. ئەورەحمانی حاجی مارف: چەند وشەیەک دەربارەی کۆمەڵە دەستنووسە کوردییەکانی ئەلێکساندەر ژابا، بەیان، ژ ، ١٠بەغدا: ١٩٧٣، ل ٨ـ ١٠.

١٠: مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، ل ٢١

١١: مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، رووناکبیری، ژ ٣ ـ ٤، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٣، ل ٢٢

١٢: مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، ل ٢٩ ـ ٤٥.

١٣ـ : Mohammad MOKRI: Recherche de Kurdologie, Contribution aux etudes iraniennes 1956-1964, Paris: 1970. P. 65-95.

14: Alexandre JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860.

١٥: Alexandre JABA: Dictionnaire kurde- Francais, St Petersbourg: 1879.

16: د. فەرهاد پیربالّ: کوردناسی لە رووسیا، چەپکە گوڵێکی دەست پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار، رۆژنامەی وڵات، ژمارە ( ١٦٢) تا ( ١٦٢)، هەولێر: مانگی ئایار تا حوزەیرانی ١٩٩٦.

١٧:ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، ل ٤٣

١٨: A. JABA: Resume de l ouvrage d Ahmed Effendi Khani, Tr. par A. JABA, in Bulletin Hist. Philologique, LXV, 1858, No 11, P. 161-171.

19:ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، ل ٢٩ ـ ٤٥.

٢٠: ب. ئا. چیخاچێیف: ئەو نامانەی سەبارەت تورکیان، بە رووسی، مۆسکۆ: ١٩٦٠، ل ٣٧؛ بڕوانە: ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، رووناکبیری، ژ ٣ ـ ٤، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٣، ل ٢٩ ـ ٤٥.

٢١: A. JABA: Ballade Kurde recueillie et traduite par A. JABA et communiquee par DE TCHITIATCHEFF in Journal Asiatique, Paris: 1859, 5e Ser., T. XIV, P. 153-166.

٢٢: " جریدە التاخی، عادات و تقالید الاکراد، بغداد: ١٩٧٢". هەروەها د. شوکریە رەسوول هەڵیگێراوەتە سەر دیالێکتی سۆرانی، بەغدا: ١٩٨٢.

ـ٢٣: د. کەمال مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، ل ١٢٥ ـ ١٢٩؛ هەروەها بڕوانە " چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد"، بەشی یەکەم، د. ر. ب. ک.، بەغدا: ١٩٨٥، ل ٣٠ ـ ٣١.

٢٤: ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، ل ٤٣

٢٥: د. معروف خزندار: مخطوطات فریدە و مطبوعات نادرە، بغداد: ١٩٧٨، ل ٤٦.

٢٦: پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار لە گۆڤاری کوردەواری دا، ژمارە ٣، لە مانگی نیسانی ١٩٧٠دا، لە لاپەڕە ١٤٢ ـ ١٤٤دا، وتارێکی بە ناونیشانی ( عەلی تەرەماخی و دەسنووسەکەی) لەبارەی ئەم دەسنووسە نووسیوە. پاشان لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧١دا بە ناونیشانی " دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی" چاپی کردووە.

٢٧: د. کەمال مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، ل١٢٩.

٢٨: د. کەمال مەزهەر: مێژوو،. بەغدا: ١٩٨٣، ل ١٢٥ ـ ١٢٩؛ هەروەها بڕوانە " چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد"، بەشی یەکەم، د. ر. ب. ک.، بەغدا: ١٩٨٥، ل ٣٠ ـ ٣١.

٢٩: د. مارف خەزنەدار: لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بەغدا: ١٩٨٤، ل ٣٨١ـ ٤٠٦.

٣٠: Mohammad MOKRI: Recherche de Kurdologie, Contribution aux etudes iraniennes 1956-1964, Paris: 1970. P. 65-95.

31: د. ئەورەحمانی حاجی مارف: چەند وشەیەک دەربارەی کۆمەڵە دەستنووسە کوردییەکانی ئەلێکساندەر ژابا، بەیان، ژ ، ١٠بەغدا: ١٩٧٣، ل ٨ـ ١٠.

٣٢: مارگرێت رۆدنکۆ: ئەدەبیی کوردیی سەدەی حەڤدەهەم، رووناکبیری، ژ ١، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٢، ل ٧٥.

٣٣: مارگرێت رۆدنکۆ: ئەدەبیی کوردیی سەدەی حەڤدەهەم، ل ٧٨.

٣٤: Mohammad MOKRI: Kurdologie et enseignement de la langue Kurde en URSS, in >> Recherche de Kurdologie, Contribution aux etudes iraniennes 1956-1964<<, Paris: 1970. P. 65-95.

35: پ. لێرخ: لێکۆڵینەوە لەبارەی کوردەکانی ئێران و خالدییەکانی باو و باپیرانیانەوە، بە رووسیە، بەرگی ٢، پیترسبۆرگ: ١٨٦٧، ل ١٢٨ـ ١٣٢. لەم سەرچاوە فەرەنسییەوە وەرگیراوە:

Mohammad MOKRI: Kurdologie et enseignement de la langue Kurde en URSS, in >> Recherche de Kurdologie, Contribution aux etudes iraniennes 1956-1964<<, Paris: 1970. P. 65-95.

٣٦: ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، رووناکبیری، ژ ٣ ـ ٤، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٣، ل ٣٨.

٣٧: د. کەمال مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، ل١٢٦.

٣٨: قەناتی کوردۆ: ژابا و رۆڵی وی د پێشڤەچوونا کوردناسییێدا، رۆژنامەی رێیا تازە، ژمارەی رۆژی ١٠/٢/١٩٧٣.

# مەم و زینـــی
## مەلا مەحموودی بایەزیدی
## یەکەم چیرۆك لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا
## ١٨٥٦

پێشــەکی

ئەم دەسنووسەی خوارەوە، کە لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەک پێشکەشتانی دەکەین، بریتیە لە یەکەم چیرۆک لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا کە بە زمانی کوردی لەلایەن نووسەرێکی کوردەوە نووسرابێت. تێکستەکە بریتیە لە چیرۆکی مەم و زین، بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو؛ مەلا مەحموودی بایەزیدی لە هاوینی ساڵی ١٨٥٦دا، لە بایەزید، لەسەر داخوازیی ئەلکساندەر ژابا نووسیویەتی.

پێش ئەم دەسنووسەی بەردەست، هەندێ پەخشانی دیکەمان هەن کە لە سەدەکانی ١٥ ـ ١٨مدا، لەنێو کتێبی ڕۆژهەڵاتناسەکاندا بڵاوکراونەتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١ـ نوێژە مەسیحییەکەی تۆماس مێتسۆب (١٤٠٠).

کوردناسی فەرەنسی، تۆما بوا، دەڵێ: لە ساڵی ١٩٣٧دا، پرۆفیسۆر عەبدول□ڵازادە لە ئارشیفخانەیەکی کۆنی ئەرمەنییەکاندا لە شاری ئێتشمیازین Etchmiadzin بە خەتی مێژوونووسی ئەرمەنی، تۆماس مێتسۆپ T. METSOP (کە لە ١٤٤٦دا مردووە) دەسنووسێکی دۆزییەوە کە لە ساڵانی ١٤٠٠دا نووسراوە و چەندین ئەلفابێی جۆراوجۆری تێدایە. هەروەها چەند نوێژێکی مەسیحییەکانی تێدایە بە حەوت زمانی جیاواز، لەوانە بە زمانی کوردیش. (١).

٢ـ چەند تێکستێکی کورت بە زمانی کوردی لە کتێبی سەفەرنامەکەی ئەولیا چەلەبی دا (١٦٦٥) (٢).

٣ـ لە کتێبە ڕێزمانی و قامووسەکەی گارزۆنی دا(١٧٨٧)، چەند کورتە تێکستێک بە زمانی کوردی نووسراونەتەوە ٣.

هەموو ئەم تێکستانە ناوبراوانە، لەبەرئەوەی بەرهەمی ئەدەبیی سەربەخۆ و نموونەی پێداگۆگی و زمانەوانین، هەروەها لەبەر ئەوەی کورد نەینووسیون، ناتوانین بە یەکەم پەخشانی ئەدەبیی کوردی بیانژمێرین.

ئەو تێکستانەی تاکو ئێستا بە یەکەم پەخشانی کوردی لە قەڵەم دراون:

١ـ کتێبە ڕێزمانییەکەی عەلی تەرەماخی ( صرف و بعضی اصول لازمە یی تعلیمە بزمانی کورمانجیە) کە بریتیە لە ڕێزمانی عەرەبی بە زمانی کوردی، لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا (١٦٠٠) نووسراوە. بەڵام مەلا مەحموودی بایەزیدی ئەم کتێبەی سەرلەنوێ لە ساڵی ١٨٥٧دا نووسیوەتەوە . (٤)

کەواتە، ئێستا ئێمە تەنیا دەسنووسەکەی ساڵی ١٨٥٧مان لەبەردەستدا هەیە نەک ئەوەی عەلی تەرەماخی کە لە ساڵانی ١٦٠٠دا نووسراوە ؛ بۆیە ناتوانین پشت بەو دەسنووسەی عەلی تەرەماخی ببەستین و بە یەکەم پەخشانی بژمێرین(٥) .

ناونیشانی دەسنووسەکە، بە فەرەنسی، کە لە لە کتێبخانەی ئەکادیمیای زانستیی ڕۆژهەڵاتناسیی لینینگرادا پارێزراوە، ئەمەیە: Gramaire kurde par Ali Teramakhi offert a l Academie Imperial des Sciences a St-Petersbourg, par A.JABA.

پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار لە گۆڤاری دەفتەری کوردەواری دا، ژمارە ٣، لە مانگی نیسانی ١٩٧٠دا، لە لاپەڕە ١٤٢ ـ ١٤٤دا، وتارێکی بە ناونیشانی ( عەلی تەرەماخی و دەسنووسەکەی) لەبارەی ئەم دەسنووسە نووسیوە. پاشان لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧١دا بە ناونیشانی " دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی" چاپی کردووە.

کەواتە، ئەم چیرۆکەی ئێستای بایەزیدی، مەم و زین، ساڵێک پێش " دەستووره عەرەبییەکە" نووسراوە؛ بۆیەش مەم و زینەکە دەبێتە یەکەم.

٢ـ مەولوودنامەی شێخ حسێنی قازی (١٧٩١ـ ١٨٧٠)، بە دیالێکتی کرمانجیی خواروو لە ساڵانی ١٨٦٠دا نووسراوە. بەرهەمەکە بە شیعر و پەخشان ژیاننامەی پێغەمبەر لە شێوەی مەولوودنامەدا دەگێڕێتەوە (٦).

٣ـ عەقیدەنامەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٩ـ ١٨٢٧)، کە لە ١٨٧٧دا ـ نزیکەی نیو سەدە دووای کۆچی دووایی نووسەرەکە ـ بە دەستی مەلایەک

سەرلەنوێ نووسراوەتەوە. تێکستەکە پێنج فەرزەکەی دینی ئیسلام بە زمانی کوردی دەخاتە ڕوو(٧) .

لەسەر بنچینەی ئەم دوو تێکستە، محەمەدی مەلا کەریم رای وایە کە مەولانا خالیدی نەقشبەندی یەکەم پەخشاننووسی کوردە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، بە رای د. عیزەدین مستەفا رەسوولیش: شێخ حوسێنی قازی یەکەم پەخشانووسی کوردە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا (٨).

هەروەها لەبارەی یەکەم چیرۆک و یەکەم چیرۆکنووسیش، زۆربەی توێژەران رایان وایە جەمیل سائیب (بە بڵاوکردنەوەی نۆڤلێتی لە خەوما لە ساڵی ١٩٢٥دا) یەکەم چیرۆکنووسە (٩)؛ هەندێکی دیکەش رایان وایە کە فوئادی تەمۆ ( بە بڵاوکردنەوەی چیرۆکێک لە ژمارە ٢ و ٣ی گۆڤاری (ڕۆژی کورد) لە ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٩١٣دا) دەبێتە یەکەم چیرۆکنووس(١٠).
بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیەی خوارەوەش: چیرۆکی مەم و زینی مەلا مەحموودی بایەزیدی ــ کە مێژووی نووسینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هاوینی ساڵی ١٨٥٦ و لە هەر هەموویان کۆنترە ــ دەبێتە یەکەم پەخشانی هونەریی کوردی و یەکەم چیرۆکی کوردی لە مێژوودا. بۆ بەڕاست پیشاندانی ئەم بۆچوونەش، دەڵێین: جگە لە بەڵگەی کۆنایەتییەکە و دێرینتر بوونەکەش، عەبدولڕەزاق بیمار، لە تازەترین توێژینەوەی خۆیدا کە لە ساڵی ١٩٩٩، بە ناونیشانی ( مێژووی پەخشانی کوردی) لە بەغدا بڵاوی کردۆتەوە، بە بەڵگەوە، سەلماندوویەتی کە هەر دوو مەولوودنامە و عەقیدەنامەکەی شێخ حسێنی قازی و مەولانا خالیدی نەقشبەندی، داهێنان و نووسین نین، بەڵکو تەرجەمەن: لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕدراونەتە سەر کوردی.

مەلا مەحموودی بایەزیدی
( ١٧٩٩ ــ ١٨٦٠)

---

مەلا مەحموودی بایەزیدی، پێشڕەوی پەخشاننووسانی کوردی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، لە ساڵی ١٧٩٩دا لە ناوچەی بایەزید لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی عوسمانی لەدایک بووە. هەر لەوێش دەستی بە خوێندن کردووە، پاشان لە تەورێز فێری فارسی بووە، ئنجا سەرلەنوێ هاتۆتەوە شارەکەی خۆی و بووە بە بەڕێوەبەری مەدرەسەی ئاینی.
شارەزایی بایەزیدی لە زمانە ڕۆژهەڵاتییەکاندا هێندە فراوان بووە کە لەناو نووسەرەکانی شاری ئەرزەڕۆمدا تەنیا روو لە بایەزیدی دەنرا بۆ نووسین بە فارسی یان بۆ وەرگێڕان لە فارسییەوە بۆ تورکی. لە زمان و ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسی و تورکیدا شارەزاییەکی بێ وێنەی هەبووە. لە نازناوە ئەدەبییەکانی، وەک چۆن ئەلکساندەر ژابا ئاماژەی بۆ دەکا: مەحموود ئەفەندی، فەقیر مەحموود ئەفەندی، خواجە مەحموود ئەفەندی١١.
کوردناسی ناودار م. پ. ڕۆدنکۆ، لە پێشەکیی ( عادات و رسوماتنامەی ئەکرادیە)دا، ل ٤، ڕێزێکی زۆر لە ڕۆڵی بەرهەمەکانی بایەزیدی دەنێت و دەڵێ: '' دەتوانم بەوپەڕی دڵنیاییەوە بڵێم: گەلی کورد لە پاراستنی گەلێک لایەنی بەنرخی سامانی ڕووناکبیریدا تا ڕادەیەکی زۆر قەرزاری مەلا مەحموودی بایەزیدییە'' ١٢.
م. بایەزیدی لە ساڵی ١٨٥٦دا لە شاری ئەرزەڕۆم ئەلکساندەر ژابا Alexandre JABA ( ١٨٠٣ـ ١٨٩٤) دەناسێ، کە لە ماوەی سالانی ١٨٣٦ ــ ١٨٦٩دا قونسوڵی رووسی بووە لە ولاتی عوسمانیدا ( لە شاری ئەرزەرۆم و ئیزمیر). ئەم یەکترناسینەی بایەزیدی و ژابا بە نوقتەگۆڕانێکی گرنگ و گەورە دەژمێردرێت لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا: چونکە لەو ساڵە بەملاوەیە کە بایەزیدی، لەژێر کاریگەرێتیی ژابادا، دەکەوێتە سەر نووسینی چیرۆک و خزمەتکردنی کولتووری کوردی.
ئەلکساندەر ژابا لەلایەن ئەکادیمیای باڵای زانستیی سانت پێترسبۆرگەوە لە رووسیا داخوازیی لێکرابوو کە کۆمەڵێک دەسنووسی کوردی کۆبکاتەوە و چەند

لێکۆڵینەوەیەک لەسەر کولتوور و زمان و ئەدەبیاتی کوردی بنووسێ. بۆ ئەم مەبەستە، لە سەرەتای ساڵی ١٨٥٦دا کۆمەڵێک مەلا و فەقێ و میرزا لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە. مەلا مەحموودی بایەزیدی یەکێک بووە لەو مەلایانەی کە بوونەتە هاوڕێی هەرە نزیکی. ئیتر مەلای بایەزیدی لە ١٨٥٦ بەملاوە، بۆتە سکرتێر و هاوکار و راوێژکارێکی تایبەتیی ژابا ١٣.

مەلا مەحموودی بایەزیدی ناوی خۆی لەسەر ئەو کتێب و دەسنووسانە تۆمار نەدەکرد کە بە هاوکاری لەگەڵ ژابا دەیاننووسی، تەنانەت ناوی خۆی لەسەر بەرهەمەکانی خۆیشی تۆمار نەدەکرد. ئەمە وای کردووە کە زۆربەی بەرهەم و نووسراوەکانی، لەوانە ئەم مەم و زینەش، بە ناوی ئەلکساندەر ژاباوە بڵاوببێتەوە و لە کتێبخانەکانی زانکۆکانی پاریس و پیترسبۆرگ و لەندەندا ناوی ئەلکساندەر ژابای بەسەرەوە بێت. بەڵام ژابا خۆیشی لە پێشەکییە فەرەنسییەکەی ( عادات و رسوماتنامەی ئەکرادیە )دا دەڵێ کە بایەزیدی نەیویستووە ناوی خۆی بەسەر نووسین و کارەکانیەوە بێت. هۆی ئەوەیش کە بایەزیدی ناوی خۆی لەسەر بەرهەمەکانی خۆی نەنووسیوە، رەنگە لە ترسی ئەوە بووبێ کە بۆ مەلایەکی وەکو ئەو کارێکی بەجێ نەبێ لە یەکێکی وەک ئەلکساندەر ژابای نامسوڵمان نزیک ببێتەوە و هەرەوەزیی لەگەڵدا بکا ١٤.

هەروەها ژابا خۆیشی ئاماژەی بۆ هەمان ئەم هۆیە کردووە١٥ .

بۆ پتر روونکردنەوەی ئەم راستییە، کوردناسی ناودار، رۆدنکۆ لە پێشەکییە رووسییەکەی ( عادات و رسوماتنامەی ئەکردادیە )دا دەڵێ: " ژابا واتا کوردییەکانی بەڕاستی و بەتەواوەتی وەرنەگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی"، " لەوە دەچێ بۆیان گێڕابێتەوە و ژابا وەری گێڕابێ" ١٦. ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێ کە مەلا مەحموود تەنانەت لە تەرجەمەکردن بۆ سەر فەرەنسیش یارمەتیی ژابای داوە. ـ بێگومان لەو ئاستانەی کە پەیوەندییان بە زمانی کوردییەوە هەبووبێ.

لەم بارەیەوە، پێویستە ئەوە روون بکەینەوە کە دەسنووس و کتێبەکانی مەلا مەحموودی بایەزیدی، هەمیشە، بە دوو زمان ( کوردی و فەرەنسی) بڵاوکراونەتەوە. بەشە کوردییەکان، هەرە زۆریان، بە خەتی بایەزیدی نووسراون. بەشە فەرەنسییەکانیش، ئاشکرایە، دەبێ ژابا بە هاوکاریی بایەزیدی تەرجەمەی سەر زمانی فەرەنسیی کردبن.

لەمەوە، دەردەکەوێ، ئەم تێکستەی بەردەست، مەم و زین، بە مولک و نووسراوی بایەزیدی دەژمێردرێ؛ ژابا تەنیا ئەرکی ئەوە بووە کە تێکستەکە، وێڕای پێشەکییەک، بە هاوکاریی بایەزیدی، تەرجەمەی فەرەنسی بکات.

مەلا مەحموودی بایەزیدی، لە ماوەی سالانی ١٨٥٦ ـ ١٨٦٠دا، لە چوار ئاستی جۆراوجۆردا یارمەتیی ژابای داوە و هاوکاریی کردووە: نووسین، نوسینەوە، تەرجەمە، هەروەها هاوکاریکردن لە ئامادەکردنی کتێبدا.

لە نامەخانەی گشتیی شاری سانت پەترسبۆرگ لە رووسیا، ٥٤ دەسنووس هەن، لەمانە ٤٤ی بە زمانی کوردییە، ٤ ی بە فارسییە، ٣ ی بە تورکییە. هەموو ئەم دەسنووسانە لەلایەن ئەلکساندەر ژاباوە ـ بەشێکی زۆریان بە یارمەتی و هاوکاریی مەلا مەحموود ـ کۆکراونەتەوە ١٧.

مەلا مەحموودی بایەزیدی، جگە لەم مەم و زینە، زیاتر لە نۆزدە دەسنووسی دیکەی هەیە کە لە لێکۆڵینەوەکانی داهاتووماندا هەندێکیان پێشچاویان دەخەین . ١٨

لەبارەی دەسنووسەکەوە

---

ئەم تێکستە بە قەڵەمی مەلا مەحموودی بایەزیدی، لە هاوینی ساڵی ١٨٥٦دا، لەسەر داخوازیی ئەلکساندەر ژابا نووسراوە: بە نیازی لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەبیاتی کوردی لە ئەکادیمیای زانستیی شاری سانت پیترسبۆرگ. یەکەم سەرچاوەی فەرەنسی کە باسی ئەم دەسنووسەی کردبێت و نیشانی دابێت بریتیە لە:

A. JABA: Resume de l ouvrage d Ahmed Effendi Khani, Tr. par A. JABA, in Bulletin Hist. Philologique, LXV, 1858, No 11, P. 161-171.

واتە ( ئەلکساندەر ژابا: پوختەیەکی بەرهەمەکەی ئەحمەدی خانی، لەلایەن ژاباوە تەرجەمە کراوە).

دەسنووسەکە، کە لەسەر کاغەزێکی بۆری فۆڵسکابی A4 نووسراوەتەوە، بریتیە لەم بەشانەی خوارەوە:

١ـ بەرگ و ناونیشان

دەسنووسەکە ئەم ناونیشانە فەرەنسییەی هەیە، کە بە خەتی ژابا نووسراوە:

Legende kurde, traduit du kurde par Auguste JABA, ancien Consul de Russie a Erzerum.

واتە " ئەفسانەی کوردی، ئۆگۆست ژابا، کۆنە قونسوڵی رووسیا لە ئەرزەڕۆم، لە کوردییەوە تەرجەمەی کردووە ".

دەسنووسەکە لەلایەن ژابا خۆیەوە، بە ئیمزای خۆی لەسەر بەرگی دەسنووسەکە، بە دیاری پێشکەش کراوە بە رۆژهەڵاتناسی فەرەنسی، CH. Schefer کە ئەو کاتە مامۆستا بووە لە ئەنستیتووی نیشتیمانیی زمان و شارستانیەتە رۆژهەڵاتییەکان کە بە ئینالکۆ ناسراوە. بەرگەکە کارتۆنێکی ئەستووری بۆرە. لە سەرەوەی کارتۆنەکەدا ئەم کۆدەی دراوەتێ: Q.Q. 1. 84

تێبینی: بە بۆچوونی هاورێی دڵسۆزم، مامۆستا ئۆردیخانی جەلیل، کە لە پاریس لە ساڵی ١٩٩٢دا پێی ڕاگەیاندم: نوسخەیەکی دیکەی هەمان ئەم دەسنووسە لە رووسیا، لە کتێبخانەی Saltykov Scedrine لە شاری لینینگراد بە ناونیشانیResume de l ouvrage kourde d Ahmed Effendi Khani, fait et trad-uit par A. Jaba, دەست دەکەوێت. بە داخەوە دەستم نەگەیشتە ئەم دەسنووسەی دووەمیان، بۆئەوەی بزانم جیاوازییان چیە.

٢ـ ژیاننامەی ئەحمەدی خانی ( ١٦٥٠ ـ ١٧٠٧ )

لە لاپەڕەی یەکەمدا: سێزدە دێڕ لەبارەی ژیان و بەرهەمەکانی ئەحمەدی خانی و مەم و زینەکەی، هەروەها لەبارەی بایەخ و پایەی ناوبراو لە ئەدەبی کۆنی کوردیدا، بە پێنووسی ژابا، بە زمانی فەرەنسی نووسراوە.

٣ـ لە لاپەڕەی دووەمدا: پێنج دێڕ لەبارەی ژیانی ئەحمەدی خانی، بە قەڵەمی بایەزیدی نووسراوە. پاشان خەتێکی بە ژێردا هاتووە و یەکسەر گێڕانەوەی چیرۆکەکەی دەست پێکردووە.

٤ـ لە لاپەڕەی سێیەم بەملاوە، هەر لاپەڕەیەک کراوەتە دوو بەشی ستوونی، خەتێکیان بە نێواندا هاتووە و جودا کراونەتەوە. بەشی دەستە راست: بە کوردیی ئەلفابێی عەرەبی؛ بەشی دەستە چەپ: بە کوردیی ئەلفابێی لاتینیی کۆن. هەموویان بەسەر یەکەوە (٥٥) لاپەڕەن.

٥ـ تەرجەمە فەرەنسییەکەی.

لە کۆتاییدا ئەلکساندەر ژابا ــ بە هاوکاریی بایەزیدی ــ تێکستەکەی تەرجەمە کردۆتە سەر زمانی فەرەنسی و لە هەشت لاپەڕەدا بلاوکراوەتەوە.

ئەم چیرۆکەی مەم و زین، کە لە هاوینی ساڵی ١٨٥٦دا نووسراوە؛ سەرەڕای ئەوەی یەکەم تێکست بووە کە ژابا ناردوویەتی بۆ ئەکادیمیای زانستیی شاری سانت پیترسبۆرگ بۆ بلاوکردنەوە، بەڵام دواخراوە و بلاونەکراوەتەوە. ڕۆژهەڵاتناسی ناودار پ. لێرخ لە ساڵی ١٨٥٨دا لەگەڵ چەند تێبینییەک بە زمانی ئەڵمانی بلاوی کردۆتەوە (١٩).

لە ١٨٥٩/٤/٢٢ لیژنەیەک پێکهات لە کۆمەڵێک ڕۆژهەڵاتناسی وەک م.م. دۆرن، بۆهتلینگ، ویێدێمان، ڤێلیامینۆف ـ زێرنۆف، بۆ هەڵبژاردنی ئەو بابەتانەی کە ژابا کاری لەسەر کردبوون بۆ بلاوکردنەوە. لیژنەکە پ. لێرخی سەرپشک کرد، ئەویش ڕای لەسەر ئەوە نەدا ئەم مەم و زینە بلاوبکرێتەوە، چونکە کورتەیەکی هەمان مەم و زینەکەی ئەحمەدی خانی ( ١٦٥٠ ـ ١٧٠٧ ) بووە و پێشتر لەلایەن پیتەر لێرخ خۆیەوە لە ساڵی ١٨٥٨دا بلاوکراوەتەوە و لەلایەن زانا و ڕۆژهەڵاتناسانەوە خوێنراوەتەوە. لێرخ حەزی دەکرد بەرهەمەکە لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا ــ کە ژابا دوو دەسنووسی لێ هەبووــ بلاوبکرێتەوە (٢٠).

بەم شێوەیە دەردەکەوێ، تا ئەم ساتەی ئێستا، هیچ چیرۆکێکی دیکە، پێش ئەم تێکستە ( ١٨٥٦ ) لەلایەن نووسەرانی کوردەوە نەنووسراوە. ئەمە لە کاتێکدا مەلا مەحموودی بایەزیدی، جگە لە نووسینی ئەم مەم و زینە، خاوەنی چەندین پەخشانی دیکەیە، لەوانە چیرۆکی (لەیلا و مەجنوون)، لەگەڵ چل کورتە چیرۆک(٢١).

کەواتە جێی خۆیەتی ناو لە بایەزیدی بنێین: یەکەمین چیرۆکنووسی کورد.

بایەخی ئەم دەسنووسە

---

ژمارەیەکی زۆر لە نووسەر و توێژەران بایەخیان داوەتە چیرۆکی مەم و زین. لە ئەدەبیاتی کۆندا، پێش هەموویان ئەحمەدی خانی ( ١٦٥٠ـ ١٧٠٧ )، کە چیرۆکە میللییەکەی لە شاکارێکی شیعریدا داڕشتەوە. لە ئەدەبیاتی هاوچەرخیشدا، عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری یەکەم نووسەرە کە لە شانۆنامەیەکدا بە ناونیشانی (مەمی ئالان) دایڕشتەوە و لە گۆڤاری ژین لە ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٩١٩دا بلاوی کردەوە.

لە ڕیزی ڕۆژهەڵاتناسەکانیش، هـ . هارتمان، ب. نیکیتین، ڕۆژە لەسکۆ بایەخێکی تایبەتیان داوەتە لێکۆڵینەوە لە مەم و زین. تەنانەت کوردناسی سۆڤیەتی، م. ب. ڕۆدنکۆ لە ساڵی ١٩٥٥، بڕوانامەی دکتۆراکەی، لە لینینگراد، تەرخان کرد بە بابەتی ناوبراو. لە کتێبەکەی د. مارف خەزنەداردا بە ناونیشانی مخطوطات فریدە و مطبوعات نادرە کە لە بەغدا ساڵی ١٩٧٨ چاپکراوە، لە لاپەڕە ٢٥دا لیستێک بۆ زۆربەی بەرهەمی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە کراوە کە باسی مەم و زین دەکەن.

---

بایەخی ئەم دەسنووسە تازە دۆزراوەیە، پێش هەموو شتێک، لەوەدایە کە یەکەم پەخشانی هونەریی کوردییە لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، واتە لە ١٨٥٦دا. پاشان، یەکەم چیرۆکە کە بە زمانی کوردی نووسرابێت. بەم شێوەیە، ئەم دەسنووسە، مەلا مەحموودی بایەزیدی دەکاتە یەکەم چیرۆکنووس و پێشڕەوی پەخشاننووسانی کورد لە بواری لێکۆڵینەوەکانی مێژووی ئەدەبی کوردیدا.

بایەخی سێیەمی ئەم تێکستە لەوەدایە کە دەتوانین ئاستی ئێستێتیکیی نووسینی کوردی و ڕەوتی پەخشانی کوردی، هەروەها شێوازی نووسین Stylis-tique بە زمانی کوردی لە کوردستانی ساڵانی ١٨٥٠دا تێبگەین.

بایەخی چوارەمی ئەم تێکستە ئەوەیە کە دەتوانین شێوازی بیرکردنەوەی چیرۆکنووس و ناواخنی بیری نووسەر، هەروەها چۆنیەتیی تێگەیشتنی ڕووناکبیرێکی کورد لە دنیا و لە ڕەگەزە ئەدەبییەکان ــ لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا ــ لەم چیرۆکەوە تێبگەین. هەروەها ئاستی پێشکەوتنی زمانی کوردی و چۆنیەتیی زمانی

کـوردی و ڕێنووسی کـوردی لەو سـەردەمـەدا، چەند بابەتێکی گرنگی دیکەی ئەم تێکستـەن بۆ وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەی توێژەران.

ئەم چیـرۆکـەی بایەزیدی، لەپاڵ هەمـوو ئەم بایەخـە جـۆراوجـۆرانەشـدا، دیسـانەوە کـەرەسـتـەیەکی کـاڵە، توێژەرانی کورد دەتوانن لەم بوارانەشدا لێی بکۆڵنەوە:

١ـ لەسەر بنچینەی ئەم تێکستەوە قاموسێکی فراوان بۆ زمـانی نووسـینی کـوردیی ئەو سـەردەمـە و بۆ دیالێکتی ناوچەی بایەزیدی ( کـــە دیالێکتی نووسەرەکەیە ) دروست بکەن.

٢ـ بەراوردی ئەم تێکستـەی مـەم و زینی بایەزیدی بکەن بە مـەم و زینەکـانی دیکە لە مێژووی ئەدەبیـاتی کـوردیدا، بەتایبـەتی مـەم و زینی ئەحـمـەدی خـانی و ئەوەی ڕۆژە لسکۆی کـوردناسی فـەرەنسی Roger LESCOT کە بە ناونیـشـانی ( مـەمی ئالان ) لە ساڵی ١٩٤٢ لە بەیرووت تەرجەمەی فەرەنسیش کراوە و چاپکراوە. لێکچوون و جیاوازییەکانیان بخەنە ڕوو.

٣ـ توێژەرانی زمـانەوانی دەتوانن بەراوردی زمـانی ئەم مـەم و زینەی بایەزیدی بکەن لەگـەڵ شـێـوەی هەمـان ناوچەدا، لێکچوون و جیاوازی و گۆڕانی دیالێکتەکە لەو سەردەمە و ئەمڕۆدا پیشان بدەن. تەنانەت دەتوانن بەراوردی بکەن بە دیالێکتەکانی دیکەش.

هەموو ئەم کارانە، بێگومان، بواری تایبەتمەندیی من نین: لێـیـان دەگـەڕێم بۆ ئەو توێژەرانەی کە لەم بوارەدا شارەزان و بەدووای " کەرەستەی کاڵ " دا دەگەڕێن.

## کێشەی ئەم تێکستە

ئەو گیـروگرفـتـانەی کە ئەم تێکستـە لە مـەیدانی لێکۆڵینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردیدا، بە تایبەتیش لە بواری نووسـینەوەی مـێـژووی پەخـشـان و چیـرۆکی کوردیدا دەیخولقێنێت، گەلێک زۆر و گەلێک بە گرێ و گۆڵ دەبن. بەڵام گرنگترینیان، ئەم دووانەن:

١ـ ئایا بە ڕاستی ئەم تێکستە دەبێتە یەکەم چیرۆک و پەخشانی هونەری لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا ؟ ئایا وا ڕێک ناکەوێ لە داهاتوودا تێکستێکی دیکە، واتە چیرۆکێک یان پەخشانێکی دیکە، لەلایەن توێژەرێکی دیکەوە، بدۆزرێتەوە و جێگە بەم تێکستـە لەق بکات ؟

٢ـ ئەم چیـرۆکـەی مـەم و زین، سـەبارەت بەوەی چیـرۆکـێکی فـۆلکلۆرییـە، هەروەها سـەبارەت بەوەی کـورتەی چیرۆکـێکی پێـشـتـر بە شـیـعـر نووسـراوی ئەحمەدی خانییە، چۆن دەکری ئێمە بە " چیرۆک" ناوی ببەین ؟ ئەو پێوەر و تەرازووە ئێستەتیکییانەی ئێمە چین کە ڕێگەمـان پێ دەبەخشن، لە بواری چیرۆکناسی و ئێستەتیکای چیرۆکەوە، ئەم تێکستە بە " چیرۆک" لە قـەڵەم بدەین؟ ئێـمـە وەڵامی ئەم پرسـیـارانـەمـان، بەفراوانی، لە بەشی داهاتووی ئەم کتێبەدا، داوەتەوە؛ بەڵام لێرەش، بەپەلە، چەند بەڵگەیەک پێشچاو دەخەین:

١- چیرۆکەکە، ئەگەرچی لە زمانی خەڵکەوە وەرگیراوە، بەڵام بریتـیـە لە یەکـەمین چیـرۆکی نووسراو بە زمـانی کوردی. سیفەتی نووسین و نووسراوەتیی ئەم تێکستـە، بەهای تێکسـتـەکـەی، لە فـۆلکلۆر دوور خسـتـۆتەوە و گەیاندوویەتیە ئاستێکی باڵاتر و جیاواز. شکسپیر و گەلێک نووسەرانی مـەزنی دیکەی دنیـا، چیرۆکی سەر زاری خـەڵکیـان وەرگرتووە و کردوویانەتە بەرهەمـێکی داهێنراو.

٢- چیرۆکەکە ناوەڕۆک و بەهایەکی ئێستەتیکیی تازەی پەیداکـردووە. ئەمـەش چونکە، چیـرۆکـەکـە، وەک لای ئەحمەدی خانیش هەمان حاڵەتە: بەناو سیستەمێکی جیـاوازی بیرکـردنەوەدا تێپـەڕ بووە کە (خەیاڵ و چێژی نووسەرێکە) نەک خەیاڵ و چێژی کۆللەکتیڤی سەرجەم مـیـللەتێک. تەنانەت نووسـەرێکی ئەمـڕۆش هەر بۆی هەیە کە ئەمـڕۆ کـار لەسـەر هەمـان چیـرۆکدا بکات و مۆرکی تایبەتی خۆی پێ ببەخشێت.

٣- ئەم چیـرۆکـە، بەپێـچـەوانەی چیرۆکی فـۆلکلۆری، نووسـەرەکـەی دیارە کـێـیـە: تەنانەت ئەسـتـێـرەیەکی درەوشاوەی ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدەهەمی کوردیە؛ زیاتر لە ٤٣ چیـرۆکی نووسـیـوە و زۆربەیان بلاوکـراونەتەوە. لەمەش زیاتر یەکەمین چیرۆکنووس یان نووسەری کوردە کـە لە مـاوەی ژیانی خـۆیدا کـتـێـبی خـۆی ( کـۆمـەڵە چیرۆکی) چاپکرابێت.

٤- ئەگەر بگوترێت کە تەکنیک و شێوازی گێڕانەوە لەم چیـرۆکەدا کۆن و فۆلکلۆرییە، پێـویستـە بزانین کـە لەو سـاڵەدا ( ١٨٥٦ )، بەشێـوەیەکی گشـتی، تەکنیک و شـێـوازی گـێـڕانەوە لە ئەدەبیـاتی هەمـوو نەتەوەکـانی دنیادا، لە ئاستێکی سادە و ساکاردا بوونە: هێشتا نە گی. دی. مۆپاسان و نە ئەنتوان چیکۆف پەیدا نەببوون.

٥- ئەگـەر ڕەخنەی ئەوە بگیـرێت کـە گـوایە بابەتەکـە بابەتێکی ئەمـڕۆیی نیـە، بەڵام بەگـوێرەی ئەوکـات: بـابـەتێکی هاوچەرخ بووە. ئەوینیش ڕووداوی هەمـوو نووسەر و سەردەمـێکە، نەک تەنیا ڕووداوی فـۆلکلۆر و سەدە کۆنەکان.

٦- هەمـوو خـاسـیـەت و مـەرجەکـانی چیـرۆک ( وەکـو: حـیـبکە، دیالۆگ، مـەنەلۆگ، پاڵەوان، ڕووداو، گرێ) لەم چیـرۆکەدا هەن. بۆیە ناکرێ بیـخـەینە خـانەی هیچ ژانرێکی دیکەوە، چیرۆک نەبێ.

### ناوەڕۆکی چیرۆکەکە

---

ئەم دەسنووسە، وەک بایەزیدی لە سەرەتای چیرۆک و لە کـۆتایـیـەکـیـشـدا دووپاتی دەکـاتەوە: " ل وەجـهی موختەسەر"، " لسەر وەجهی کورتی و ئیختیسار زبدا کتێبا مەم و زینێ یە"؛ واتە: بریتیە لە کورتەی چیرۆکی مەم و زینەکەی ئەحمەدی خانی.

بایەزیدی بۆ گێڕانەوەی چیرۆکی مەم و زین، پشتی بە کـتـێـبـەکـەی ئەحـمـەدی خـانی بەسـتـووە، بەڵام لە کـاتی

گێڕاەنەوەدا هەندێ گۆڕانکاریی دیاری خستۆتە ناوڕۆکی چیرۆکەکەوە. بایەزیدی هێندە بایەخی بە گێڕانەوەی لایەنە سیاسی و بیرە نەتەوەییەکە نەداوە. بۆیە، دەتوانین بڵێین شێوازێکی دیکە و گێڕانەوەیەکی جیاواز و سەربەخۆیە لەچاو ئەوەی ئەحمەدی خانی. ئەمەش بەتایبەتی لەڕووی پەیڕەوکردنی سیستەمی پەخشان و بەکارهێنانی توخمەکانی گێڕانەوەی چیرۆکدا: دیالۆگ، مەنەلۆگ، دروستکردنی حیبکە، گرێ، شێوازی گێڕانەوە.

تەکنیک و شێوازی نووسینەوەی ئەم دەسنووسە و چۆنیەتیی ساغکردنەوەی

لەم دەسنووسەدا، بێگومان، ڕێنووسی کوردیی کۆن بەکارهاتووە. کاریگەرێتیی سیستەمی نووسینی فارسی و عەرەبی یان ڕێنووسی عوسمانلی، زۆر دیارە بەسەر ئەم دەسنووسەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، کاریگەریی زمانی عەرەبی، هەروەها بەکارهێنانی لەرادەبەدەری وشەی زمانەکانی دراوسێ، بەتایبەتیش عەرەبی، تێگەیشتن لە تێکستەکەمان بۆ زەحمەتتر دەکات.

سەرەڕای ئەمەش، ژمارەیەکی زۆر لە وشەکان نەدەخوێنرانەوە. ( ژ ) و ( ز)، ( ک) و ( گ)، ( ج) و ( چ)، هەروەها ( ف) و ( ڤ) جیاوازییان دیار نیە. ڕێنووسە لاتینییەکەش بە شێوەی کۆن نووسراوە و ئەویش هەر خوێندنەوەی ئاستەنگە. لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، ڕەچاوی دانانی نیشانەکانی خاڵبەندی بە هیچ شێوەیەک نەکراوە.

دەبێ بە ڕاشکاوییەوە بڵێم: ئەمە یەکەم جارە شانی خۆم دەدەمە بەر ساغکردنەوەی دەسنووسێکی وەها ئەستەنگ و زەحمەت. ئێستا تێدەگەم کە ساغکردنەوەی دەسنووس چەند شەونخوونی و ماندووبوونی دەوێت. شانازیش بەمەوە دەکەم کە دۆزینەوەی یەکەم چیرۆکی کوردی و ساغکردنەوەی یەکەم پەخشانی کوردی لە مێژوودا کەوتە ئەستۆی من.

لە ساغکردنەوەی ئەم دەسنووسەدا، تێکستەکەم بەشێوەیەکی گشتی هێناوەتە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆ. هەوڵم داوە، بەپێی توانا، تێکستەکە لە سیستەمی ڕێنووسی فارسی و عەرەبی ڕزگار بکەم و بیخەمە دەفری زمانی کوردییەوە؛ بێ ئەوەی دەست لە ناواخن و شێوازی نووسینەکەی بدەم و هیچ بگۆڕێت. وشە عەرەبی و بێگانەکانیشم، وەکو خۆیان، بە ڕێنووسی کوردی نووسیوەتەوە. وشە عەرەبییەکانی کە کورد هێندە بەکاریان ناهێنێ، وەک: قەصەب و مرخص العنان و تبدیل القیافە، وەکو خۆیان نووسراون. ئەو وشانەیش کە باون وەک: تاریخ، سیلسیلە...هێناومنەتە سەر ڕێنووسی کوردیی ئەمڕۆ. لە کۆتاییشدا فەرهەنگیلەیەکم بۆ پەیڤە گرانەکان ئامادە کردووە.

لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەدا، " واو" وەک وشەیەکی ئامرازی پەیوەندی و " وای عەطف " یەکجار زۆر بەکار هاتووە، تەنانەت لەجیاتی خاڵ و فاریزەش هەر " واو " دانراوە. ئێمە لەجیاتی هەندێک لەو واوانە، بە مەبەستی باشتر تێگەیشتن لە نووسینەکە، هەندێک جار، فاریزە یان خاڵمان داناوە. بەم شێوەیە، سەرجەم نووسینەکەم خاڵبەندی کردووە. بێگومان ئەمەشیان هەر بۆ یارمەتیدانی خوێنەر، بۆئەوەی بتوانێ تێکستەکە بەئاسانی بخوێنێتەوە.

لەباری تەکنیکیی چیرۆکیشەوە، داشی دیالۆگەکان، بەپێی پێویست، خۆم دامناون. هەندێ لە مەنەلۆگ و خۆدوواندنەکانیشم خستۆتە نێو دوو کەوانەی بچووکەوە: بۆئەوەی لە گێڕانەوەکە جودا بکرێتەوە. بە لامەوە باشتریش وابوو کە دەسنووسەکە بە پیتی لاتینی بنووسمەوە بۆئەوەی برا کوردەکانی کوردستانی غەیری عیراقیش تێی بگەن و سوودی لێ ببینن. بەڵام، من کە کارەکەم تا نیوەی هێناوە، بام ئەوانیش تەوای بکەن و هەڵیگێڕنە سەر لاتینی.

ئەم تێبینییەش دەخەمە سەر قسەکانم کە تەرجەمە فەرەنسییەکەی ئەلکساندەر ژابا، لە زۆر شوێناندا و بەشێوەیەکی گشتی، هێندە کۆک و تەواو نیە. لە کاتی بەراوردکردنی کوردی و فەرەنسییەکەدا، هەستم دەکرد کە بایەزیدی چیرۆکەکەی دێڕ بە دێڕ، بە فارسی یان بە تورکی، بۆ ئەلکساندەر ژابا باس کردووە و ئەویش بە فەرەنسییەکەی خۆی نووسیویەتیەوە. بێگومان دەبێ هەموو کارەکانی دیکەشیان هەر بەم شێوەیە ئەنجام دابێ.

لەبارەی چۆنیەتیی ساغکردنەوەی دەسنووسەکەوە: بە ئەمانەت نووسیومەتەوە. هەر خوێنەرێکی کوردیش تێکستە ساغکراوەکە بخوێنێتەوە، بە ئاسانی تێیدەگات. ئەوەی دەمێنێتەوە، پەیوەندیی بە هەندێ گۆتن و دەستەواژەی ئەوتۆوە هەیە، کە بۆم ساغ نەبوونەوە و ئەمانەن:

قاطا سووڕەتەکی دبینە / هیسای بە بن کوتی / میرم معذور بدیرین ئەڤ بنی نەخوشم هاتمە ڤرا و من تا کرت قەت مەجالا لپات و حەرەکەتی نادیرم لڤرا / یاو اگر دبە دی / توو کیی ادنایە ؟ / حەرەم کهیاسە / خۆ ئاڤا نا ژی بە نیەتا ڤی عاجزی / کطک بە شوڤە نە مایی بالجملە.

وشەیەکی تر لەبارەی تێکستەکە

بایەزیدی، وەک لە کتێبی عادات و رسووماتنامەکەشدا هەر ڕای وایە " ڕەچەڵەکی کوردان دەگەڕێتەوە سەر عارەبان". لە یەکەم دێڕی ئەم تێکستەش هەر هەمان ڕای هەیە: ( ژ طایفا کورمانجێد عەرەبان، ژ سیلسیلا حەزرەتی خالد). ئەو حەزرەتی

خالیدەی لەم تێکستەدا ناوی هاتووە، ئەسحابەیەکی پێغەمبەر بووە، لەبەر ئازایەتییەکەی ناونراوە " سیف الله". لەم بارەیەوە، چینی باڵای کورد بەلایەوە بەرزی و شەرەفێک بووە کە ئەسڵی خۆی بۆ پێغەمبەر و ئەسحابەکانی پێغەمبەر بگەڕێنێتەوە. ئەمە ڕەوایی دەبەخشییە ئەو دەسەڵاتەی کە ئەو چینە باڵایە هەیانبوو. بێگومان ئەم ڕایەش نەسەلماوە و ڕاست نیە.

## ئەنجام

ئەوەی بە بڵاوکردنەوەی ئەم دەسنووسەی خوارەوە دەمەوێ بیسەلمێنم ئەوەیە: چیرۆکی مەم و زین، نووسراوی مەلا مەحموودی بایەزیدی، کە لە هاوینی ساڵی ١٨٥٦دا بە دیالێکتی کرمانجی نووسراوە، یەکەم پەخشانی کوردی و یەکەم چیرۆکی کوردییە لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا. بەم شێوەیەش، مەلا مەحموودی بایەزیدی دەبێتە یەکەم پەخشاننووسی کورد و یەکەم چیرۆکنووسی کورد.

سەرچاوە و پەراوێز:

1: Thomas BOIS: Bulletin Raisonne d Etudes Kurdes, Imprimerie Catholique, Beyrouth: 1964. P. 551.
هەروەها بڕوانە: د. فەرهاد پیرباڵ: ئینجیل لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا ١٨٥٦ – ١٩٥٦، بڵاوکراوەکانی: مەڵبەندی ئاشتی لە دهۆک، دهۆک: ١٩٩٩، ل ٢٤ – ٢٥.

2: د. فەرهاد پیرباڵ: زمانی کوردی لە ساڵی ١٦٥٥دا، لەناو کتێبی ( زێڕی ناو زبڵ)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی: ١٩٩٩، ل ٥٢ – ٥٧. هەروەها بڕوانە: ئەولیا چەلەبی: سیاحەتنامە، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، لە بڵاوکراوەکانی ک. ز. ک.، بەغدا: ١٩٧٩. مامۆستا سەعید ناکام بەشێکی نووسراوە کوردییەکانی لابردووە، بۆ تێکستە بنچینەییەکە، بڕوانە چاپە عوسمانییە تازەکان کە هەڵگێڕدراونەتە سەر ئەلفابێی تورکیی تازە:
A-Evliya Celebi Seyahatnamesi, Altinci Kitab, Mehmed Zilli oglu, Turkcelestiren: Zuhuri DANISMAN, Ankara: 1970. p. 136-185.
B-Evliya Celebi Seyahatnamesi, Cild: III- IV, Ucdal Nesryati, Ankara: 1986. p. 474-490.
C-Martin Van BRUNSSEN: Evliya Celebi, The Relevant Section of the Seyahetname, edited with translation, commentary and introduction by M. V. BRUNSSEN, Holland: 1988.

3: Morizio GARZONI: Grammatica e vocabulairio della lingua kurda, Rome: 1787.

4: ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، گۆڤاری ڕووناکبیری، ژ ٣ ـ ٤، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٣، ل ٤٣

٥: بۆ شارەزایی زیاتر لەبارەی دەسنووسەکەی عەلی تەرەماخی، بڕوانە بەشی کۆتایی ئەم کتێبە.

٦: شێخ حسێنی قازی: مەولوودنامە، سلێمانی، ساڵی ١٩٣٥.

٧: محەمەدی مەلا کەریم: عەقیدەنامەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عیراق ـ دەستەی کورد، بەرگی هەشتەم، بەغدا: ١٩٨١، ل ١٩٩ـ٢٢٢.

٨: د. عزالدین مصطفی رسول: الواقعیە فی الادب الکردی، بیروت: ١٩٦٦، ل ٢٠٦.

٩: حسێن عارف: چیرۆکی هونەریی کوردی، دەزگای بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا: ١٩٨٤.

10: مەحموود زامدار: چیرۆکەکەی فوئادی تەمۆ، گۆڤاری بەیان، ژمارە ٩٦، بەغدا: ١٩٨٤؛ هەروەها بڕوانە: گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٠٢، بەغدا: ١٩٨٤.

١١: A. JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860.

١٢: د. کەمال مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، ل ١٢٨.

١٣: د. فەرهاد پیرباڵ: کوردناسی لە ڕووسیا، چەپکە گوڵێکی دەست پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار، ڕۆژنامەی وڵات، ژمارە ( ١٦٢) تا ( ١٦٢)، هەولێر: مانگی ئایار تا حوزەیرانی ١٩٩٦.

١٤: هەمان سەرچاوە.

١٥: د. ئەرەحمانی حاجی مارف: چەند وشەیەک دەربارەی کۆمەڵە دەستنووسە کوردییەکانی ئەلێکساندەر ژابا، بەیان، ژ ، ١٠بەغدا: ١٩٧٣، ل ٨ـ ١٠.

١٦: Mala Mahmud BAYAZIDI: Adat u Risumatnamay Akradiya, publie par les soins de M. RUDINKO, Moscou: 1963.

17: د. معروف خزندار: مخطوطات فریده و مطبوعات نادره، بغداد: ١٩٧٨، ص ٣٨ ـ ٥٨.

١٨: بۆ زیاتر شارەزایی لەبارەی ژیان و بەرهەمەکانی م.م. بایەزیدی بڕوانە:
Xebat u jiyana Melle Mehmude BEYAZIDI, in Kurdistan Press, Hej 58, Stockholm: 1989.

19: Lerch: ,, Bericht Uber,, : Resume de l ouvrage kurde d Ahmed Effendi Khani, fait et traduit par A. Jaba, Mellanges Asiatiques, tome II, 1856-1859, P. 242-255.

20: Bulletin de la classe historico - philologique de l academie imperial des sciences de St Petrsbourg, Tom XVI, P. 254 et 299.

21: عبدالله حداد: دره ثمينه من التراث الثقافى الكردى، دراسه حول كتاب " جامعى رسالت و حكايتان"، فى عشره حلقات، جريده التاخى ( ركن: دراسات كرديه)، عدد: ١٢٥٤ ، ٨ /٢ /١٩٧٣.

٢٢: د. مارف خەزنەدار: لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بەغدا: ١٩٨٤، ل ٣٨١ تا ٤٠٧.

### دەسنووسەکە

ژ شاعیرێ، د کورمانجان، ب زمانێ کورمانجێ، د تاریخا هەزار و شەش صەت□یدا، د قەصەبا بایەزیدا، حەزرەتێ ئەحمەدێ خانێ کت□یا کوو تەئلیف کرییە ب وەزن١ ب□ناڤێ مەم و زین، عاشق و مەعشوق، ل وەج□لێ موختەسەر بەیانا وان دکە.

د زەم□انێ پێشین، د وەقتێ طایفە الملووکاندا٢، د تاریخا شەش صەد و چەند سال□ەکێ هیجرەتیدا، ژ طایفا کورم□انجێد عەرەبان، ژ سیلسیلا حەزرەتێ خالد، بخۆسەر، نە دبن حوک□لێ کەسەکیدا حس□یب کە ـ کوورا زەمانێ خۆ د جەزیرە و ئەتراف لێ ویدا هەر چێ طای□فەیێ کورمانجان کو هەبوو دن□یڤ واندا وەکێ ق□ڕال□ەکێ بخۆسەر٣؛ میر زەینەددین ناڤ م□یرەکێ ب ناڤ و شان و مرخص العنان، خوویێ٤ مەقسەد و مەرام هەبوو.

ژ بۆ م□یرێ مەعلووم ژێ حەم□وو ئەسب□ابێ خوندکارێ و مرادخوازێ ژێ د دەرجا کەمالێدا بوو و میرێ مەعلووم ژێ د حوسن و رەندیدا نادره الزمان.

دوو خوە دیرا. ن□اڤێ یا مەزن ستێ و ن□اڤێ یا بچووک ژێ ژ ن□یڤێ ن□اڤێ وێ بوو کوو زین دبە. ئەڤ هەر دوو ک□چێد پاک، سپێ، گەهانە دەرەجا کەمال□ێ. دن□یڤ حەرەمس□ەرایێدا خەدامەک و جەوارێ د خزمەتا واندا بە ناز و نیعمەت پەروەردە، بە کەیف و سەف□ایێ د ع□ێش و زەوق□یدا بوون. ژ هەر کەناران خوازک□ێن و تال□ب□ێد وان هەبوون، لاکین لەورا کوو هەنگوف نەبوون نەدان.

دیسان ژ ن□یڤ جزی□رێ، ژ ئەشراف لێ بەگزادان و ئەعیانان، ئەسکەندەر ناڤ پەهلەوانەکێ زەمانەیێ هەبوو. سێ□ کور□ێد وێ ژ هەبوون، قەوێ بەهادر و خوویێ قووەت. ن□اڤێ یا مەزن تاجدین و ن□اڤێ یا نیڤەکێ٦ چکۆ و ن□اڤێ یا بچووک عارف بوو. ئەڤ هەر س□ێ ژێ، د خزمەتا مێردا دبوون. ئەمما تاجدین، قەوێ مقەرەب□ێ میر بوو و زەحف٧ ژێ لنک میر ق□ەوێ زێدە مرعێ الخاطر بوو.

د وێ وەقت و زەم□انێ□یدا، ل وان ک□ەناران، عادەتەکێ قەدیم بوو کوو سال□ێ جارەکێ، د وەقتێ ن□ەورۆزێدا سەرێ س□الێ دک□رن. وێ رۆژێ، ئەهلێ و خەل□کێ ب□اژێر، حەموو، فەقیر و دەول□ەمەند، مەزن و بچووک، ن□ێر و م□ێ، عمموومێ، ژ بۆ گەشت و گەڵ□یانێ، ب دەرڤە دچوونە دەشت و سەح□رایێ.

جنس جنس و رەف رەف، ژ دەرڤە رەسما کەیفخۆشیا عیدا ن□ەورۆزێ ل وێ دەرێ ئیجرا دکرن، لەورا ٨ وێ زەمانێ قس□مێ طایفا ژنێ د موس□لمانان حەموو مەستوورە و ڤەش□ێرتێ بوون٩؛ ب□ە رووێ نامەحرەم و بێانیان نەدکەتن. لاکن رۆژا کوو ئەو عیدا ن□ەورۆزێ دبوو، حیجاب و پەردە ژ طایفا ژنان رادەبوو؛ م□ێر و ژن وێ رۆژێ بەهەڤ خوویا دبوون ١٠. ئەگەر کەسەکێ قیزەکێ باکیرە١١ هەبووب□ا، وێ وەقتێ، ک□وڕێ عەزب ددیتن. هەر کەسێ کوو مەیل و محەببەتەکێ دکر، ئەگەر هنگوف بوویا پاشێ بە ئەمرێ شەریعەتێ ژ بۆ خوە دخواستن. ژب□ۆ ڤێ خەب□ەرێ، وێ رۆژێ، پیر و جوان، عموومێ، ب دەرڤە چووبوون و ل گەشت و سەیرانێ بوون.

دیسان ژ ئەهلێ جزی□رێ لاکن ژ دەرجا نیڤەکێ، دگەل تاجدین هەمعومر، ناڤێ مەم جوانەک هەبوو. دبیرزادە ب□وو ئەو ژێ. دگەل تاجدین ژ قەدیمدا عەقد و بەندا کمرا برایەتێ گرێدابوو و عەلاقا محەببەت و مۆدەتا صادیقە گرێدابوو. ه□ەر دایم دگەل یەک و دوو دەکەتن و رادەب□وون. وێ رۆژێ، میر زەینەددین ژێ ژبۆ حەموو غولام دخ□لێرا دەستوورا چوونا گەشت و سەیرانێ دا. تاجدین ژێ ه□ات دگەل برایێ خ□ۆیێ صادق، مەم.

هەر دوو کەتنە لیباسێ د ژنان، تبديل القيافە د س□ولاوەتێ ژناندا، چوونە ن□یڤ جەمعیەتا مەزکوور. ل□ڤرا ل وێ دەگەڕ□انێ کەن□اڕێ ئەم ببنە حال□ێ ستێ و زی□نێ. ئەوان ژێ فکر کرن. ئەو هەر دوو ژێ کەتینە لیباسێ م□ێران: تبدیل الجامە، ئەو ژێ چوونە ن□یڤ جەماعەتێ. د وێ زەمانێ کوڕکاشو لیەزەتن ١٢، عادەت بوو. ستێ و زین ل س□ولاوەتێ لاوان، دگەل ک□وڕێد جوان کوو کاشو لیەزەتن، د وەقتێ ئەوان ئەو روال دلیەزێ دا عاجز کربوون، تاجدین و مەم□ۆ ژێ وێ وەقتێ راست کوللەن د لیباسێ ژناندا هاتن□ینە وێ دەرێ و ئەو ح□اڵ و قەرەبال□غا خەلقێ دیتن.

ئەڤ ئەحوالا ژ مرۆڤەکێ پیر پرسیار کرن. ئەو ژێ جواب دا ک□وو دوو لاوێد جوان پەیدا بوونە و هەر چێ جوان کوو دلیزیدایە بە زورا م□ێد خۆ لیزا کوو کاشوێ ژ وان ئەستاندین. لاکن قەت کەس ئەو نەناس□ین. ژ ڤێ

ب لاژێیه، ئەمما کـینه ؟ نەهاتە زانین. ئەڤ خـەبەرا تاجدین و مەم کوو د سەلواتا ژنان بوون کوو بهیستن چوونە نێڤ قەرەبالغی. ژ کەنارەکێ، کوو ستێ و زین کـوو د شکلێ کلواندا بوون، دیتن. فی الحال یەعنێ تافلێ ژ کەنارێ خودێدا تاجدین ل ستێ و مەم ل زینێ موبتەلا و عاشق بوون.

عەلاقا ڤاێ ١٣ ل وان هەردووکان گەلێدان و ژ کـەنارێ سـتێ و زینێ ژێ دیسـان وەها عـەلاقـا محەببەتێ د کەمالێ دەرەجێدا پەیدا بوو، ژ هەر دوو طەرەفاندا بیلا نیهایە بە یەک و دو را پابەندێ ئەڤیێ بوون و تاجدین و مەم ژ کەمالێ دەرەجا مۆدەتێ خۆ شـمەراندن و حسێب کە بێ هۆش بوون.

لاکن ستێ و زین، چونکە ئیـختیـارا وان ژ دەست نەچووبوون، نێزیکێ وان بوون. سـتێ مـوهرا خـۆ یا جەواهێر دەرئانێ، کرە تلوویا تاجدین و موهرا وێ ژێ دەرئانێ کـرە تلوویا خـۆ. وە زینێ ژێ، دیسـان وەها، موهرا خۆ دەرئانێ کرە تلوویا مەمێ و موهرا مەمۆ ژێ دەرئانێ کـرە تلوویا خـۆ. پاشێ ب تەرەف حـەرەمسـەرا خۆ ڤەچوون.

پاشێ وان، تاجدین و مـەم ژێ ژ مـیـا حـیـرەتێ هشیار بوون. تاجدین د تلوویا خۆ موهرەکێ جەواهێر دێ کوو لسەر وێ نڤێ ستێ هاتیە کولان و نەقش بوویە، مـەم ژێ وەها مـوهرەکێ جـەواهێرێ دێ کـوو لسەر وێ نڤێ زینێ هاتیە نویسین. ئەڤ هەر دوو، وەها گـرفـتـارێ بەلایێ ئەڤینێ بوون. د ڤێ حالێدا مات، متەحەیر بوویێ مان ژ کنارێ دنێ ئەم ببنە ئەحـوالێ سـتێ و زینێ. ئەو هەر دوو ژێ ڤەگەریان، هاتنە حەرەمسەرا خۆیێ خاص. ئیدێ گاڤ ب گاڤ کەتنە ئاگرێ عەشق و محەببەتێ، رۆژ بە رۆژێ جـۆش و خـرۆش دکـر. ئەو هەر دوو ژێ زار و زەعـیـف بوویێ شـەڤ رۆژان هاوار و گـازێ دکـرن و حالێد وان پەریشان بوو.

داێنەکێ ١٤ وانێ پیـر، عـەجـووزە، سـالخـورێ و دنیـادیتێ و د ئومـوورێ دنیایێ زەحف ١٥ ئیـدراک و پرفنوون ناڤێ ( حیـزەبوون) هەبوو. ئەو داین، کـوو حالێد وان وەها پەریشان دێ، کەتە شـەبهێ و سەبەبێ پەریشانێ و مەلالا ئەحوالێد وان پرسیار کر.

ژ ئیپتیدا ئەوان ئینکارێ گرت. پاشێ، داین ژ بۆ وان وەعـد و عـیـد گـر، قـاطا ئەڤ دەرد و ئەڤ حالا، لسـەرێ سـالێ ل وە پەیدا بوویە، هەر چاوانە ئەگـەر ژ شەلالێ ئنس و جن و پەریـیـان ژێ ببە، ئەلبەتە تەدبیرەکێ و عیلاجەکێ کرن ژ دەست من تێ، ڤێ دەردێ ژ من خف ١٦ کـرن جـایز نینە. پاشێ چڤا دەچە باعیسێ هەلاکا وە دبە ؟

وەکێ وها گـۆتە وان، سـتێ و زینێ ماجەرا وەکێ بوویێ، کماکان، تەقریر و بەیان کرن. داین جەواب دا کوو ئەلێ خەبەرا وە قەوێ قەنج دەلیلێ خودایە، لاکن ئەڤە کوو دبێژن مە کچ دێیە و حەباندێیە ١٧. کچ کچان بحـەبینن و عـاشق ببن بێ فـایدەیە و ثەمـرە نادە، بەلکو کچ ل کورانێ و کوران ل کچان عاشق دبن و ژ هەڤـدوو بەهرەمـەند دبن. ژ دوو کـچـان چە حـاصـل دبە ئەگـەر فی الواقع ایدوە دیتێ ئەگەر کوران دبن. ئەز د علوومـاندا مـاهرم، ل عـەسـمـانان مـەلایک، ل عـەردێ پەرێ ژێ بن ئەز دێ ب قـووەتا عیلمێ نجـوومێ و رەمێ بیبینم و مەسخەرێ وە بکەم.

پاشێ، ستێ و زینێ وێ ئەڤ بهیستن، ئەو موهرێ د کـوو بەرێ ژ تاجـدین و مـەمـۆ ئەسـتـاند و ئانێ بوون بدەرئانین و دانە دەستێ دایێ. ئەڤە نیشانێد وان کچان ئەگەر براستێ توو عـیلمێ رەمێ دزانێ خوویێ یێ دوان ببینە کوتن. داین ژێ موهرا ئەستاند.

د وێ زەمانیدا دنێڤ جزیرێدا مەلایەکێ قەوێ ماهیر رەمـمال ١٨ هەبوو. چوو نک مـەلایێ رەممال و گـۆت کـوو دوو کوران منێ سێوێ هەنە. رۆژا سـەرێ سـالێ چوونە گـەلەریانێ، پاشێ کـوو ڤەگەریان، نەخـۆش و بەدحالن، لاکین د دەستێ واندا هەر یەکێ هەنگوستێرەک هەیە. ئەڤە چە حالە و چە بەلایە؛ ئەز نزانم. مـەلایێ رەممال گـاڤـا کـوو فکرێ ل شکلێ رەمێ، نڤێ ستێ یێ دگەل تاجـدین و نڤێ زینێ دگەل مـەمـۆ دیت. وەکێ ئەحوالێ ژ رەمێ زانێ، گۆتە دایێ:

ـ ژبۆ چە درۆ دبێژێ ؟ ب درەوان شـوغلێ نابە. دیتن.

پاشێ، ئەو مـادە وەکێ بوویێ ژ ئەوەلێ حـەتتـا ئاخیرێ ژبۆ دایێ نەقل کر و بەیان کر و گۆت کوو خوودێ ١٩ مـوهران یەک بەگـزادەیە و نڤێ وێ تاجدینە و یەک ژێ دبیـرزادەیە و نڤێ وێ مـەمـە. وە لاکین ئەو هەر دوو ژێ ب ڤێ دەرد و ئەلەمـا عـەشق و ڤایێ موبتەلا و نەخۆش بوونە. رابن هوون خۆ بێخنە شکلێ حـەکیـمـەکێ و هەتا ئەوان ببینن. وێ وەقتێ، ئەحـوالێ دزانن. لسەر ڤێ خەبەرێ، تەبدیل اللباس بوو، خۆ خستە لیباسێ حەکیمان، چوو جەم کو تاجـدین و مـەم ل وێ بوون. وەکێ داین د سەراوێ حەکیمان دیتن:

ـ توو حەکیمێ، وەرە زوو ناخۆشێ د مە هەنە بێرە و دەرمان بکە !

هەکا داین بێنە نک تاجدین و مەمۆ، هەر چیە نیرێ و نیزا وان حسێکە گۆت پاشێ خەلقێ کوو ل وێ حازر بوون ب دەرڤە دەرئانێ کوو ئەوێ دەرمان بکەم.

پاشێ، وەکێ ئەوان ب تەنێ مـان، ئەحـوالا وەکێ بوویێ گـۆتە وان و مـوهرێ د وان دەرئانێ، دا دەست وان و دگەل گـۆتنا ئەحـوالێ ژ سـتێ و زینێ سلاڤ ئانێ و ئێمنایێ و تەسەلێ دا دلێ وان، کوو خودێ مـەزن ان شـاء الله غـەمـان مـەکـەن د نێزیکدا لسـەر خـەبەرێ قـاطا سەراوەتەکێ دبینە. وەها گـۆت و ژ

تاجدین و مەمۆ خاتر خواست، هاتە نک ستیێ و زینێ و مـرگـێنیێ ژیێ دا وان و دیتنا تاجـدین و مـەمـۆ و ئەحـوالا وەکیێ بـوویێ ژ بۆ وان را ژیێ بـەیـان کــر، سالا وان ژیێ گەهاندە ڤان و ئیمانیێ و دل خۆشیێ ژیێ دان وان، تەسـەلا کـر کـە حـالا ئەحـوالیێ مــەعلوومیێ هەر دوو کــەنـاران ب ئاگــاریێ عەشقیێ رۆژ بـە رۆژ ئالاو دەگرت.

تاجـدین، کــوو بەگــزادە و خـانەدان بوو، پاشیێ مووددەیەکیێ، مەلا و ئەعـیانێ جزیریێ بەرهەڤ بوون و چوونە نـک مــیـر زەینەددین. رجـا و هـیـڤیێ ب ئەمـریێ خـودیێ، دانا ستیێ ژ بۆ تاجدین و چراغ کرنا ویێ ٢٠ دەرخواست کرن. وە میر ژیێ رجا وان قبـوول کریێ، ستیێ دا تاجدینیێ کـو ویێ. وەقت و زەمـانیێ تـەدارەک و پێک هاتنەکیێ دروست حــازر کــرن و دزـیڤ هەندەک وەقتەکیێدا داوەتەکیێ خوندکارانە کریێ. ستیێ بـکرن و عـەقدا نیکاحا ویێ ل تاجـدین کرن. ئەو هەر دوو، عاشق و مـەعـشووق، دگەل یەک دوو گەهانە مـوراد و مـەقسـەدیێ. لاکین مـەم و زین دیسـان وەک خۆیدە د ئاگـریێ عـەشـقیێدا دشـەوەتیێ لسەر حالیێ خۆ بە ئاخ و داخ مایین.

پاشیێ، میر زەینەددین دەرگەوانەکیێ حەرەمیێ هەبوو، قەویێ، حـرامزا و موفتین و تلبیس، ناڤیێ ویێ بەکر بوو. ئەو حـرامزا، مەخسووس ژ حەسد و دوخسیێ و نیـفـاقـیێ د ڤیێ شـۆلیێدا درەفت. چاڤ را دکـر، رۆژەکیێ، ئەویێ مـیـر خلوە ٢١دیت و حـسیێ کـوو ژبۆ خـیرخـوازیێ چەند خەبەریێ د من هەنە ئێفادە بکەم. گۆت:

ـ ئەیێ بـەگێ ٢٢، کـوو دانـا ستیێ بە تاجدین شۆلەکیێ نـە لایق بـوو. لیـکـن هەر چیـــــە، تـە ئەو دا؛ چوو بەگزادەیە. لاکن مـەم کـوو دبیـرانـە و چاڤیێ ویێ ژیێ لزینیێ یە و تاجدین حسـیکە، بخۆسەر، زین دایە مەمۆ. وەک دگەل ویێ قەول کریە. ئەڤ چە خەبەرە ؟ ئەڤـە دەوریێ غـیرەت و مـەزنایێـیە ! ئەڤ چیە ؟ ب ڤیێ، هوون چەوان راحەتیێ دبن ؟ میـر بـەگێ باوەر نەکر کو کوا ئەسـلێ ڤیێ خەبـەریێ نەبە. " ئەز زانـدە تاجدین و مەمـۆییێ حەزدکەم. ئەو ژیێ شۆلیێد وها نەلایق ناکەن و کرنا وان قەت تەسەوور ناکەم". " ئەگــەرچە " گــۆت ژیێ " لاکن بەکــریێ منافق ب هەر طەرزیێ دەست بە ئیـفترا و بوهتانان کر". لسـەر ڤیێ ژیێ مددەتەک زەمان بووریێ.

مـەم جـودا و زین جـودا، هەر یەک بە دەردیێ عـەشـقیێ دشەوەتن. وها پیلەکیێ چوو.

باغـچـەیەکیێ مـیـر زەینەددین، قـەویێ، دلگوشـا و جـیهەکیێ کەیف و سەفاییێ هەبوو، کوو دنـیڤ ویێدا ئۆتاغیێ دیوانخانە و قولەتین و بغـەیر ژ وان هەر چیێ لازمیێ د ابرا خوندکارانە حەموو مەوجوود بوو و مرەتەب و مزەیەن ئامادە. هەر لەوازماتیێ کوو دڤا، دایما هەبوو.

جارنـان دگەل نەدیم و مـوقـەررەب و ئەعـیانـان دچوونە ویێ جــێ کــەیـف، ل ویێ دەویێ عـــەیش و عوشرەت دکرن.

رۆژەکیێ مـیـر دگەل نەدیم و ئەتباعێد خـۆ چوونە نـیچیریێ؛ ئەو باغـچـە وها مـشـمر، ڤالا مـابوو. دل زینیێ تەنگ بوو، ژ بۆ تەفەروجیێ ب تەنێ هاتـە ویێ باغـیێ و دگەلیا. مەگـەر ژ کـەناریێ دنیێ مـەم ژیێ، کـوو ب تـنیێ مـابوو، دل ویێ ژیێ تەنگ بوویێ، ئەو ژیێ ب تەنێ راست کـــوللەن هاتـە ویێ باغیێ.

مـەم و زین دنـیڤ رەزیدا لقایێ هەڤ بوون. هەر چە دوو عاشق و مـەعشووق هەڤدوو دیتن، جارکرن و جارکن بە کەیفخۆشیێ عنان، ئیـختیار ژ دەست چوویێ، هەر دوو عاشق و مەعشووق بە ژوورڤە دەرکەفتنە دیوانخانـەییێ و هەڤـدوو حـەمـیزکـریێ دگەل یەک و دوو، عـاشق و مـەعـشـووقـانە، دەست بە خـەبەردانیێ کریێ. یەک جـار وەقت و چاغ و هاتنا مــیـــریێ ژ بیــر کـرن. ب ڤیێ حالیێ، ژ مـیـا ڤیێ سەرخۆش بوویێ د کـەیف و سەفـایێدا بوون حەتتا ئاڤار ژیێ نیزیک بوویێ.

قەزایێ ناگەهانیێ، میر زەینەددین نیزیکیێ ئێڤاریێ ژ نـیچیریێ زڤڕیێ، وها راست هاتە باغـیێ. ل بەر دەریێ ویێ قـەسرا مـەعلووم ژ هەسپیێ پیـا بوو. ل ڤـر شـەربەت و قـاوەیەکیێ بخـۆن و هیـسـایێ بە بن کـوتیێ دگەل غـولام و ئۆلداشێد خۆ وها ژ نشکیـڤە هاتنە دەرا قـەسـریێ کـوو مـەم و زێن تێدا بـوون. زێن ویێ وەقتـیێ کـوو دەنگیێ بـرایێ خۆ بیـهیـست هۆش هاتە سەریێ و گـۆت مـەمـۆ کـوو " چە دبیژیێ و چە دەکـەیێ؟ ئەڤە میر هات! ".

کـوو ئەڤ خـەبەرا گـۆت، ئیـدیێ، ناچاریێ، مـەم زین ئەسـتـانـدە بـنیێ عـەبا خۆ و ڤـەشـارت و ل گـۆشـەیەکیێ قـەسـریێ قـەلبـەخیێ و رۆنیـشت دنـیڤ دوو بـالکیـاندا وەک ب ویێ حالیێ. مـیر دگەل قەرەبالغا خۆ هاتە هوندریێ قـەسـریێ و دیت کـوو مـەم خـۆ ل عـەبـایێ پێچایە ل گـۆشەیەکیێ روونیشتیـیە. میر سلاڤ دا ژیێ، مـەم سلاڤ ئەسـتـاند ئەمما قـەت ژ جـهیێ خـۆ نەبزافت. میرم معذور بدیرین ئەڤ بنیێ نەخوشم هاتمە ڤرا و من تا کرت قەت مەجالا لپات و حەرەکەتیێ نادیرم لڤرا وها مام میر گۆت کوو زەرەر نینە ل کەیفا خۆ نـێرین. مـیـر رۆنیـشت و هەر کـەسـەک جـێیـەجێ رۆنیـشتن. دیوانخانە تژیێ بوو. مـیـر شەربەت و قـەهوە ئەمر کـر. " ئیشەڤ ل ڤرا کەیفەکیێ بکەن". گۆت.

ژ هەر تەرەفەکیێ دەست بە کـەلام و خـەبەردانیێ کرن. مــەجلیس کــملیێ و گــەرم بوو. تاجــدیـن د ویێ مەجلیسێدا حازر بوو. ل حالیێ مەمۆ نـێریێ، زانیێ کـوو ژ ئەحـوالەکیێ عـەجـیـبـە. خـالیێ نینە کـوو مـەم وها نوقـیێ بەحـرا غـــەمـــان بوویە. تاجـدین رابوو هاتە نـیزیکیێ مـەمـۆ و بە ئیـشـارەت ئەحـوالیێ ویێ ژیێ پرسـیـارکـر. مـەم ژیێ دوو کـەزیێ ژ پێرێد زینیێ ژ

هۆچکا عەبایێ لێ بە خف دەرئانێ و نیشانێ تاجدین دا. وەکێ کوو تاجدین ئەڤە دیت ما وە چیە فەهم کرێ کەتە بەحرا فکر و حیرەتێ لێ، چارە و تەدبیرا ڤێ چیە ؟ ئەگەر تەدبیرەک نەبێ لێ ئەڤ مەجلیس دێ دبە و ئەڤ شۆلا پاشێ ئاشکەرا دبە. مەم و زین رسوایێ بووێ تلف النفس دبن و ب ... ژ وێ زەحف فتنە و فەساد ژێ ب ڤێ سەبەبێ لێ پەیدا دبە. دەرحال ... ژ مەجلیسێ لێ ب دەرڤە دەرکەت و چوو گەها مالا خۆ و گۆتە ستێ:

ــ زوو زارۆیێ خۆ دگەل ماتکێ هەل ... ین و بدەر کەڤ !

هەر چقاس کوو ستێ پرسیار کر کوو چە ئەحوالە ؟ گۆت کوو نها وەقتێ خەبەر دانێ نیە کوتێ ئاگر هلاتێ و ژ چار کەنارێ خانیێ خۆ ئاگر و شەواتە دا بخۆ ژێ ژ دەرڤە دەست بە هەوار و گازیێ کر. خەلقێ کوو گازێ و هاوار بهیستن، ئەحوالێ گۆتنە میر. وەکێ ئەڤ حالا مەعلوومێ میر و خەلقێ کو د قەسرێدا ل وێ مەجلیسێ دا بۆ هەر کەسەک بە زێ نە دفعا ئاگر و شەواتێ و د قەسرێدا بغیر ژ مەم و زینێ کەسەک نەما مابین. وەکێ خالێ بوو، مەمۆ گۆتە زینێ کوو:

ــ تە دێ تاجدین چەوان وەکێ حەزرەتێ خدر گەها ئیمدادا مە و بە چە تەرزێ ئەڤ بەلا ... ئاسمانێ ژ سەرێ مە دەفع کر ؟

زین رابوو، چوو سەرا حەرەم خانە. مەم ژێ رابوو، هاتە دەفعا شوانێ. خولاسە حەتا هاتن مەجمووعێ مال و ئەمڵاکێ تاجدین دەرێیا برایێ دا سووت و یارێ وێ ب ڤێ واسیتە ژ بەلایێ رەها بوو.

خوێێ کتێبێ لێ دبێژە کوو یاو اگر دبە دێ پاشێ دیسان بەکرێ موفسید و غەمازا واندا بووێ چاوانە ئەڤ ماجەرا حس کریە و ئەڤ ئەحوالا بە خف گۆتە میر و میر ژێ زەخف غەزەبناک کر. میر ژێ بە چە تەرزێ ئەم واقفێ حەقیقەتێ ڤێ شۆلێ بین.

دیسان، ئەو موفسید و مەلعوون گۆت کوو:

ــ میرم، رۆژەکێ، بە خەف، مەجلیسەکێ بچووک، مەمۆ ب تەنێ لێ، بێ تاجدین و چەکۆ و عارف، بحوزە ! بلا تێ لێ بێ ... تن ! دگەل مەمۆ بە شەرت شەترەنج بلەیزن ! وەکێ توو دبەێ، ئیلحاح ل مەمۆ بکە کوو توو کێ دحەبینێ ؟ بێژە: من ئەز ژ بۆ تە دێ بخوازم. ئەز ملاحەزە دکەم کوو مەمۆ مرۆڤەکێ بێ پەروایە، حەباندنا زینێ دبێژە وە. وێ وەقتێ ئێدێ شوبهە نامینە؛ جەزا وێ تەرتیب دەکەێ. بەنا لسەر ڤێ خەبەرێ کوو ل حزوورا وە ئەز خۆ هاتە دحەبینم دبێژە، موجبێ سیاسەتێ دبە.

لسەر ڤێ خەبەرێ، میر، بە خف، مەمۆ گازێ کر و رۆنیشت. گۆ:

ــ وەرە دگەل تە شەترەنج بلەیزم. ئەگەر ئەز دەستینم و ژ تە دبەم، لسەر ڤێ قەولێ مەراما من ئەوە کوو هەر کیژان کچێ دلخوازا وەیە توو بێژێ ! ئەز ژ بۆ تە ... بستینم و بدەمە تە.

لسەر ڤێ شەرتێ، هەر دوو لیەزتن. میر سێ دەست تەمامێ ژ مەمۆ برین. ئیدێ ئان گۆرا شەرتێ خۆ دەست بە پرسکرن کرێ.

مەمەگەر ل وێ مابەینێ تاجدین ژ ڤێ بەحسێ خەبەردار بووێ. بخۆ دگەل هەر دوو برایێد خۆ، چەکۆ و عارف، چەک و سلاح را بەستێ. ل وێ ... هاتنە مەجلیسا میر. ئیدێ میر ژێ قەوێ ل مەمۆ ئیلحاح دکر کوو بێژە بەکرێ موفسید ... کوو مەم ئیغماز دەکە و نابێژە. ئەوێ موفسیدێ، بە تەعن و نج، گۆتە میر، کوو " میرم ئەز دزانم یا مەمۆ حەباندێ، قیزەک عەرەبانە لیڤ دقاندێ".

وەکێ موفسیدێ وها گۆت، ئێدێ مەم ژ عینادێ تەحەموول نەکر. بێ ئیختیار، جزئەک ژ ئەوصافێد زینێ دەست پێ کر، گۆت کوو " میرم، ئەێ کوو ئەز دحەبینم نەجیب و فلان و بەگزادەیە، نهایت الامر چقاس ٢٣ کوو مەم زێدە عرنێ نەکێ ژێ زینە و خوها وەیە ٢٤". گۆت.

ئێدێ میر ژێ هاتە غەزەبێ و گۆت کوو " ئەێ نمەک حەرام توو کێیێ ادنایە ؟ کیێ توو ل خوها من عاشق ببێ و نەکێ وێ ژێ ل حزوورا من ئاشکارا بێژێ ؟ ". گۆتە قەبیلا غولامان:

ــ ئەڤێ بگرن و بەند زندان بکن !

ئەمر کر، تاجدین دگەل هەر دوو برایان، بە سلاح، رابوونە لسەر پێیان و ل مەمۆ دەرکەتن و گۆتنە وان کوو ل ... دەلێ حەتتا ئەم نەمرین کەسەک ژ وە نێزیکێ مەمۆ نابێ.

میر فکرێ، کوو ... فتنە و فەساد را بێ بخوە رابوو دەستمالا خۆ ئاڤێتە ئەستۆیێ مەمۆ وەشاندە زندانێ و تاجدین دگەل بران. ئیدێ ژ خاترێ میر نەبوورین، رابوون مەئیووس و عرنێ ژ وێ دەرێ هاتنە مالێد خۆ. مەم ژێ مددەتەکێ زاڤ د زندانێدا مایێ.

زین ژێ، ژ ڤێ کەیفیەت و ئەحوالێ، بێ حسێب مەلوول و مەحزوون، شەڤ و رۆژان شۆلا وێ هاوار و گازێ بوو و مەم ژێ بە حەسرەتا رووێ زینێ د زندانێدا گریان و نالان ما و تاجدین دگەل بران و ئەتباعان ژ میر رووگەردان و سل د مالێدا خۆدا سەکنین.

لسەر ڤێ حالێ مقدارێ شەش مەهان مەم د زندانێدا مایێ ژ ئارەزوویا روویێ یارێ و زەحمەتا بەند و زندانێ رۆژ بە رۆژ زەعیف و ژار و پەریشان ... بووێ قەوێ کەسب حالەکێ خراپ کربوو.

لسەر ڤێ خەبەرێ، بەکرێ موفسید ژ ڤێ ئەحوالێ پەریشانیا مەمۆ خەبەردار بوو. د فکرکر کوو " ئیدێ مەم ژ ڤێ دەرێ خەلاس بووێ مەحالە لەورا

میحنەتا عەشقێ و زوعفا حال ێل وێ تەئسیر کریە کوللەن ب ێ دەرمان بوویە. ئەڤە د ن ێزیکدا فووت دبە ٢٥ . زەرەر و خرابییا وێ قاطا دگەهیتە من ''.

لەورا تاجدین، قەوی، پەهلەوانەکێ نامدار بوو، وە ئەڤ یەکێ موفسید ژێ ق ەوێ زێدە ترسا. هیلاکێ دەکر ئیدیێ ژبۆ خۆ ف کرا یا خەلاسەت ێ و نەجات ێ گرێ. د وەقتەکێ تەنها دیسان طورێ حیلان تژێ کر. چوو نک میر زەینەدین، پاش عەرزێ خلووس و ئیبرازا سەداقەت ێ، دەست بە خەبەرداز ێ کرێ، گۆت:

ـ میرم، ئیرۆهە خاصە ئەز چوومە زنداز ێ و من مەم دێ و قەوێ و قنج ل زوعفێ حال ێ وێ و م ەوزا وێ ٢٦ کوو د دل ێ شغەل تە، من فەهم کر و من ن ێلێ نەبزا وێ دگرت عەلامات ێ ژی ێ کوللەن ژێ چوویە، بەل کو د دەرجا مـــریاندایە. یانێ من بیەقین گەر کوو ئەگەر فی الواقع حەزرەتێ مەسیح و حەزرەتێ لوقمان ژێ ب ێنە سەر وێ چارەیەک لژێ ناوێ نابێ، ب ێ شەبەهـ مرنا وێ موقەرەرە. وەکێ مەم ب ێ حال ێ د زنداز ێدا تەلەف ببە مەعلومێ دەول ەتا وەیە کوو ژ کەنارێ تاجدین و بران و تەعلوق و ئەتباع ێد وان د ێ ب ێدا چە دەرەجە فتنە و فەس اد ێ پەیدا بب ێ و بەل کو ێ د جزیر و م لکێ بۆهتان و مابەینا عەشایر و قەبای ێد واندا لڤان ئەتراف و کەناران حەتتا رۆژا حەش ێ بروودەت و دوژم نێ ێ واقیع ببە. خولاسە ب ێر ژ سەبەبا ب ایەکێ عەزیمە، بیلا شەبەهـ ـ، ێ ببیتە باعیسێ هەلاکا مە ژێ. وها بووین، ئەمرەکێ ئاشکەرایە، ئەڤ قەصەبا وەکێ هاتێ زکرکرن بەر وەجهێ بەیان ئیفادا میر کرێ و بە میر ژێ دا فەهماندن.

میر ژێ کوو بهیست، ب راستێ، درک ا ێ شۆل ێ کرێ. ق ەوێ زێدە کەتە فکر و غەم ێ و گۆت کوو یا تەدب یرا ێ چیە ؟ ژ بەک ێ موفسید پرسیار کر. موفس ید ێ مەلعوون گۆت:

ـ بتەز ێ چارەیەک ێ ێ شۆل ێ هەیە کو سەلامەت و خلاسیەتا میر و من و ولات ێ ب وێ دبە ! من فکر کرییە هوون وسانێ باسن ژ وێ شۆل ێ ژێ کەس ناموس و ئیعتیبارا هەوە نابێتن !

میر گۆت کوو ب ێژە ببینم ! دەست بە خەبەرداز ێ کر:

ـ میرم، توو ئەسەح بزانە کوو مەم دمرە، بەلکو د دەرەجا مریاندایە. ن ها ێ کەن تاجدی ن دگەل بران گازێ حزوورا خۆ بکەن و دل ێ وان ڤەکرە و بە هەر یەکێ خەلاتەکێ بدە و بب ێژە کوو ئەز لەوێ و ل مەمۆ پەشیمان بووم و کنها من بە مەمۆ هات. لاکن چە چارە مقەددەر وها بوویە. من د ب ەدەلا ێ زول ێ دا زین دا مەمۆ. هوون ه ەن بە کەیفا خۆ بن ! ئەز ێ دکەم مەمۆ ژ زنداز ێ بدەرت ێنم و ت ێنمە حزوورا خۆ خەلات و کرمان دکەم، زی ێ ژێ دەدەم و چراغ دکەم. پاشێ ه ەن د حەرەمسەرایێدا زی ێ ژێ گازێ حزوورا خۆ بکە و دل ێ وێ ژێ ڤەکرە و ئەمرێ وێ بکە کوو چەند جەواری ان دگەل خۆ ببە و ه ەرە زنداز ێ و مەمۆ ببینە و ژ کەنارێ من س ڤ بکە و دگەل خۆ ژ زنداز ێ بدەوی نە: ئەز ێ ب ئەم ێ خ ولێ تە بدەمە مەمۆ ! وها بکە، مەم خۆ دمرە و نامێنە. ئەم ژێ ژ ب ەلایێ خەلاس دەبین و میرم ناموسا وە ژێ ناش کێ، ئیعتیبارا میریا وە ژێ ل ج ێ خۆ دمینە.

میر ژێ کوو ئەڤ خەبەرا ژ بەک ێ موفسید بیهیست، قەوێ بەگەن کر، مەعقوول دیت. وەکێ زیکر بوویێ، شاند تاجدی ن دگەل بران گازێ د نمایێ دا و مطیب الخاطر خەلات دا وەعد و وەعید کرن .دیسان وەکێ زکر بوویێ چوو حەرەمس ەرایێ خوها خۆ، زین، گاز کرە نک خۆ. وەکێ هاتە گۆتن، ئەو ژێ د خۆش کرێ. گۆت کوو ه ەن بخۆ مەمۆ ژ بەند و زنداز ێ ب دەئینن و ب ینن ئەز ژێ ێ لسەر تەدارەک ێ بم د ن ێزێکدا داوەتا وە بە کەیف و سەفا بکەم، هوون ژێ د عەیش و عەشرەت ێ دا بن.

ئەڤ خەبەر و ئەڤ شۆلا دن ێڤ جزی ێدا وەکێ م ژگێنێ بلاڤ بوو و هەر کەس کەیفخۆش و شاد بوون کوو حەزرەتا میر ل مەمۆ هاتە رەح ێ و ژ زنداز ێ بدەر ئانێ و خوها خ ۆ، زین ێ، دگەل مال و خەلاتان ێ بدەتن و چراغ بکەتن.

بەنا لس ەر ێ خـەب ەرێ زی ن ژێ، ژ ێ خسووس ێ، کەیفخۆش و شاد بوویێ، خەمل و زینەت دا خۆ، ژ سەرێ حەتت ا پێیان د و زی ێدا غەرق بوویێ، زیب و زینەت دا خۆ دابن لبەر و حەرەم کەهیاس ە ل پێش و خەددام و جەوارێ لا طەرافان بە قەرەبال غەکێ تەمام بەرا خۆ دا زنداز ێ و داخلێ حەپسخاز ەبێ بوو. جەوابا هاتنا زی ێ م ژگێن بەرێن ژ بۆ مەمۆ. لاکن چە فایدە ؟ پاشێ چ ؟ بعد خراب البصرا. هەر چیە، زین هات و مەم دێ حەم ێز کرێ. وەکێ دەست بە خەبەرداز ێ کرن، مەم ێ ژار دەرح ال رووح بە تەسلیم کر ژ دارێ دن یایێ ئاخیرەت ێ ئیرتیح ال کر.

وەکێ ئەڤ حالا ئەهلێ زنداز ێ و زین و حازرێ ئەو ێ دە ێ کوو دیتن ب ێ ط ەر ێ ژار و سەفیل، مەمۆ د زنداز ێ ب ێ حال ێ زول مەن تەلەف و هلاک النفس بووین؛ ل هەر کەسەکێ دشوار ه ات و پێ شەوتین و هاوار و گازێ و گرین و زارێ بوو کوو حس یبکە وەکێ رۆژا قیامەت ێ پەیدا ب وو و ژ ێ شۆر و شماتە یێ دن ێڤ ب ێدا و لولە و غەوغا زاهیر بوویێ. تاجدین و برا و عەشایر و قەبای ێد دن ێ و عمومێ خەلقێ هاتن شین و ماتەمەکێ مەزن پەیدا بوو.

م یر ژ ێ واق عەیێ خەبەردار بوو، ئەو ژێ هاتە ش یێ. هەرچێ عوزر و بەهانە دکرین. ئەمما پاشێ چە !

مەم ئیدێ لسەر عادەتێ ب دفنا نەعشا وێ مەشغوول بوون.

د وێ نافێ قەضاء بەکرێ موفسید راستێ تاجدین هات هەمان فێ الحال خەنجەر کێشا، هەما ل وێ دەرێ، ئەو بەکرێ خەبیس و مردار جەزایێ وێ لایق تەرتیب کر، قەتل کر و لەشێ وی مرار ئاڤێتنە کەنارێ کوو لێ ڤە کێ.

نەعشێ مەمێ، تاجدین دگەل بران لسر سەرێ خۆ داینن و میر زەینەدین و زین و باشقە٢٧ عموومێ عولەما و سولەحا و ئەعیانێ ویلایەت و ئەهلێ بازێر حەموو بە شینەکێ عەزیمە و بە قەرەبالغەکێ زاڤ بەرێن چال کرن. پاشێ کوو زین بشوڤە هاتە حەرەمسەرایێ، ئەو ژێ بێ کەیف بووێ و برایێ خۆ میر زەیندەین گازێ نک خۆ کر. ژ وێ رجا و هیڤێ کر، کوو:

" ئەڤێ خەدامەکا٢٨ خۆ عەفوو بکەن ! ئەز ژێ دێ بخازیێ ئاخیرەتێ کۆچ بکەم و هەندەک وەسیەتێ د من هەنە دێ ل حزوورا ویا عالێ عەرز بکەم و لسەر داد و عەدل و ئینسافێ عادەتا ئەوان هیڤیان دێ بکەم. ژ لەوازماتێ حقووقێ د برایەتێیە کوو ئەوان دەرحەق ڤێ زەعیفەیێ ئیجرا بکەێ. نها کوو مەم فووت بوو و خەدامەکا وە ژێ لسەر چوونێیە. ئیدێ ریزا حیەسما داوەتێ ئیجرا کر و هەندە قەدەر مال و پرتال تەجهیز دایە ستێیێ و پاشێ ئەو قەدەر رەسم و رسوومات و کەیف و شاییا خوندکارانە بالاجرا مەزن کرێ، ئەو قاس ئاین و قەواعید دەستوور و سرووری مرەتەب کرێ. تە ئەو بە مەقسەدا خۆ شاد کرن. ئەڤ خەدامەکا وە ژێ لسەر ئوسوولا عەدل و ئینساف و حەقانەتێ ئەو قەدەر حصە و پار و نەسیب هیڤێ و ئیلتیماس و ئیسترحام دکەم بارێ د دنیێدا ژ بۆ ڤێ زەعیفەیێ مەیسەر نەبوو د ئاخیرەتێدا ژێ بێ پار بووین. مخالفێ مروەتا وە یا عالێ بووین. شۆلەکە ئاشکرایە. بەنا لسەر ڤێ خەبەرێ، سێ هیڤێ د ڤێ ەسما داوەتێ ئیجرا کر و هەندە قەدەر مال و پرتال تەجهیز دایە ستێیێ و پاشێ ئەو قەدەر رەسم و رسوومات و کەیف و شاییا خوندکارانە بالاجرا مەزن کرێ، ئەو قاس ئاین و قەواعید دەستوور و سرووری مرەتەب کرێ. تە ئەو بە مەقسەدا خۆ شاد کرن. ئەڤ خەدامەکا وە ژێ لسەر ئوسوولا عەدل و ئینساف و حەقانەتێ ئەو قەدەر حصە و پار و نەسیب هیڤێ و ئیلتیماس و ئیسترحام دکەم بارێ د دنیێدا ژ بۆ ڤێ زەعیفەیێ مەیسەر نەبوو د ئاخیرەتێدا ژێ بێ پار بووین. مخالفێ مروەتا وە یا عالێ بووین. شۆلەکە ئاشکرایە. بەنا لسەر ڤێ خەبەرێ، سێ هیڤێ د ڤێ عاجزێ هەیە، قبوول بکەن ! ئەووەلێ ئەوە کوو ئەمر بکەن رۆژا مەرگا من، وەکێ رۆژا داوەتا ستێیێ، عموومێ حەموو سووق و بازار و کۆلانێد بازێری بخەملینن و تەرتیب بکەن؛ هەرچێ کوو ئالاتێ کەیف و شاێیە حسێبکە کوو گوویا داوەتە ئیجرا بکەن و دنیێڤ سەرا عالیدا ژێ دەستە خوانێد زاد و تەعامان حازر بکەن ! خەبەرا خەدامەکا وە بووێ. دیسان وەها، حەتتا سێ رۆژان حەموو ئەهلێ بازێر، مالدار و فەقیر، بێین گازێ بکرین، بێین تەعام و زاد بخۆن و بچن. وەها سەرف و بەزل ببە. بغەیر ژ ڤێ ژێ، هەرچێ کوو حەزرەتا وە حەتتا سالەکێ تەمامێ د سەرا عالیدا و یان بغەیر ژ وێ د جهێ دنیێدا خەرج و مەسرەف دەکەن، ثەوابا وان ژ ببەخشنە روحێ ڤێ خەدامەکا خۆ ئاڤا نا ژێ بە نیەتا ڤێ عاجزێ سەرف و بێنە داین. وەسیەتا دوویێ، ئەمر بکەن حەموو ئەهلێ بازێر، مەزن و بچووک، مێر و ژن، کطک بە شوڤە نە مایێ بالجملە دگەل نەعشێ من بە تەبایێ بێین و ببەنە مەقبەران. وەسیەتا سێیێ، ئەوە کوو مەزرێ من٢٩ ژێ ل تەنشت مەزرێ و قەبرێ مەمێ، کوو مەزلوومەن بێ سووچ فووت بووێ، بێتە کۆلان و بێتە حازر کرن. وەقتێ کوو ئەڤێ زەعیفەێ پیادە دکەنە نیڤ قەبرێ، وێ گاڤێ ژێ حەزرەتا وە بە دەنگەکێ بلند کوو ئەو خەلقێ حازر بووێ حەموو بێین ببێژە کوو من بە حوسن و رەزا خۆ زین دا مەمێ. وهان سەدایەکێ پاشێ ئەڤێ زەعیفەێ داینینە نیڤ قەبرێ و بسپێرینە خودێ. وەسیەتێ د من ئەڤ بوون؛ گۆت ".

وە رۆژەکێ پاش، زین ژێ کۆچ کرێ، چوو دارالبقایێ. وەکێ هاتە گۆتن، ماتەما وێ هاتە گرتن. ئەو ژێ تەکفین و تەجهیز کرن، وەکێ کوو هێڤێ و نیاز کربوو، ب وێ طەرزێ بەرن و دگەل مەمێ چال کرن.

ئەڤ داستانا ژ وان دنیێدا یادگار ما و حەکایا وان دنیێڤ عموومێ کوردستانێ مەشهوورە و گۆیا وها دبێژن کوو لسەر قەبرا هەر یەکێ ژ وان دارەکێ گولێ هشین بوویە و بە ژوورڤە سەر کیشایە و ل هەڤدوو پەچکینە. نها ژێ الان قەبر د وان کڤشە و ل وان ئەترافان بوویە زیارەتگا. هەر کەس جارنان دچێتە زیارەتا وان.

ئەڤە، لسەر وەجهێ کورتێ و ئیختیسار، زبدا کتێبا مەم و زینێ. ئەڤ قەدەر ل ڤرا هاتە گۆتن ژ ڤێ زێدە حەقیقەتەن حالێ ئیدێ قنج جەنابا حەزرەتا خودێ تەعالا دزانە، لەورا ئەڤ حەکایە نێزیکێ هەشت سەد سالێ هەیە کوو واقیع بوویە. ئیدێ، راستێ جەنابا خودێ تەعالا بخۆ دزانە عالم السر و الخفایا هەر ئەوە. تمه

فەرهەنگۆک:

١: ب وەزن: بەنرخ ٢: د وەقتێ طایفه الملوکاندا: لە سەردەمێ دەسەلاتدارێتیێ میرەکاندا

٣: وەکێ قەرالەکێ بخۆسەر: وەک پاشایەکێ

سەربەخۆ ٤: خوێی: خاوەن
٥: دوو خوهـ دیرا: دوو خوشکێ هەبوو ٦:نیڤکێ: ناوەنجی ٧: زەحف، زاف: زۆر
٨: لەورا: چونکە ٩: ڤەشارتی بوون: شاراوە بوون
١٠: بەهەڤ خوویا دبوون:پێکەوە دەردەکەوتن
١١: قیزەکێ باکیرە: کچێکی عازەب ١٢: کاشوو لیەزەتن: گەمەیێ کاشوو. جۆرە گەمەیەک بووە.
١٣: ڤاین، ڤین: ئەڤین ١٤: داین: دایەن. داینەکێ: دایەنێکی.
١٥: خف، بە خف: نهێنی، بە دزییەوە.
١٦:حەباندییە، دحەبینێ: خۆشێ ویستووە، خۆشێ دەوێ.
١٧: رەمال، فالگرەوە، سیحرباز. عیلمێ رەمالێ: سیحربازی و فالگرتنەوە.
١٨: خودانێد: خاوەنێ. خوویێ: خاوەن. ١٩: چراغ کرن:پێشکەشکردن.
٢٠:خلوە: تەنیا. ٢١: برایێ: برا. بران: براکان.
٢٢:چقاس: چەند
٢٣:خوها وەیە: خوشکێ ئێوەیە. خوهـ: خوشک
٢٤: فووت دبە: دەمرێ
٢٥: مەلەزا وێ: نەخۆشێی ئەو ٢٦: باشقە: هێ دیکە، جگە لە ئەوان هێ دیکەش
٢٧: خەدامەک: خزمەتکار ٢٨: مەزرێ من: گۆڕێ من. مەزر، مەزەر: گۆڕ. مەزەرگا: سەرگۆڕ.
٢٩: ژ دەرجا نیڤەکێ: لە پلەێ ناوەراست، لە چینێ ناوەنجی.
٣٠: هنگوف: هاوقووف، هاوکووف، ئەوانەێ لە یەک ئاستێ کۆمەلایەتیدان.
٣١:ئێد وە دیتێ: ئەوانەێ ئێوە بینیتان.
٣٢: هووچک: قۆل.

ئەم چەند وشە گرانانەێ خوارەوەشم، بەپێی قاموسەکەێ بایەزیدی ـ خۆێ ساغ کردۆتەوە، کە قاموسێکی هەکاری ـ رەوەندی ـ فەرەنسییە، بە هاوکاریێ ئەلکساندەر ژابا ئامادەێ کردووە و لە ١٤ێ مارسێ ١٨٥٨دا لە ئەرزەرۆم نووسراوەتەوە. ئەمە ناونیشانە فەرەنسییەکەیە: Vocabulaires Kurdes des dialectes de Hekari et Revendi par A. JABA . بۆ یەکەم جار، د. مارف خەزنەدار ئەم قاموسە دەسنووسەێ ساغ کردەوە ٢٢ . قاموسێ ناوبراو سوودێکی زۆرێ دەبێ بۆ ساغکردنەوەێ واتا نادیارەکانێ ئەم تێکستە و هەر دەسنووسێکی دیکەێ بایەزیدێ.

تافلێ: دەم و دەست قاطا: هەڵبەتە، قطعا
هیسایێ: راحەت
لپات: حەرەکەت کرت: جار بنێ: کوهر

# جامع یی رسالیان
# یەکەمین وتارە ئەدەبیەکان بە زمانی کوردی (١٨٥٨- ١٨٥٩)
## سێ وتاری ئەدەبی

بەشی چوارەمی ئەم کتێبەمان بریتیە لە چەند وتارێک کە پیتەر لێرخ P. Lerch، لە پێشەکیی کتێبەکەی ژابا Jaba دا ناوی ناون (ریسالە)، ژاباش بە Notice واتە (تێبینی )تەرجەمەی کردوون. (١)
وتاری یەکەم بریتیە لە باسکردنی هەندێ هۆزەکانی کوردستان و زانیاری لەبارەی ژیانیان، لەگەڵ لیستی ناوی ژن و پیاوانی کورد. وتاری دووەم کورتیلە باسێکە لەبارەی ژیانی هەشت شاعیری دێرینی کورد. وتاری سێیەم ناساندنی دەسنووسەکەی عەلی تەرەماخی یە کە لەبارەی رێزمانی عەرەبی، لە سالانی ١٦٠٠دا، نووسیویەتی و م. م. بایەزیدی، سەرلەنوێ، لە ساڵی ١٨٥٧دا، نووسیویەتییەوە.
ئەم سێ پەخشانە بریتین لە تەنیا دە لاپەڕەیەک، بەلام بە یەکەمین وتاری ئەدەبی Article دەژمێردرێن لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا. نەمازە، وتاری سێیەم (مقدما علمێ صەرفێ..) دەبێتە یەکەمین وتارێک لەبارەی زمانەوانی یەوە نووسرابێت.
وتاری سێیەم (مقدما علمێ صەرفێ و بعضی اصول لازمەیی تعلیمیە بزمانی کورمانجی)، لە ١٨٥٨دا، بە پێنووسی مەلا مەحموودی بایەزیدی نووسراوە. بریتیە لە چەند تێبینییەکی گشتی و سەرەتایی، یان وەک خۆی ئاماژەی بۆ کردووە ( پێشەکییەک) بۆ ناساندنی کتێبەکەی عەلی تەرەماخی کە لە سالانی( ١٦٠٠) بە ناونیشانی (صرف و بعضی اصول لازمە یی تعلیمە بزمانی کورمانجیە ) لەبارەی رێزمانی عەرەبی نووسیویەتی. (٢)

ژابا لە دوو نامەدا، کە لە ١٨٥٨/٦/١٧ و ١٨٥٩/٤/٢دا ناردوونی بۆ رۆژهەلاتناسی ئەڵمانی، لێرنهاردت دۆرن، باسی ئەوە دەکا کە ئەم کتێبەی عەلی تەرەماخی، پێش ساڵی ١٨٥٧، بە دەسنووس، لەلای مەلایەکی خەڵکی هەکاری بووە و داوای لێکردووە بیداتێ یان بیفرۆشتێ، نەیفرۆشتووە. پاشان مەلا مەحموودی بایەزیدی دەچێتە لای ئەو مەلایە و لێی وەردەگرێت؛ لە ساڵی ١٨٥٧دا دەینووسێتەوە؛ ئنجا پێشەکییەک لەبارەی ژیانی رۆشنبیریی ناو مزگەوتەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان و شێوازی دەرس خوێندن، لەگەڵ کورتەیەکی ژیانی عەلی تەرەماخی دەنووسێتەوە. ئەم وتاری لێرەدا پێشچاوتانی دەخەین، بریتیە لەو پێشەکییەی م. م. بایەزیدی کە بۆ کتێبەکەی عەلی تەرەماخیی نووسیوە.
ژابا کورتەیەکی کتێبەکەی تەرەماخی و پێشەکییەکەی بایەزیدی تەرجەمەی فەرەنسی دەکات و لە ١٨٥٨/٦/١٧دا دەینێرێ بۆ رۆژهەلاتناسی ئەڵمانی، لێرنهاردت دۆرن. پاشان لە ١٨٥٩/٤/٢دا سەرجەم بابەتەکەی عەلی تەرەماخیی بۆ دەنێرێ کە بە خەتی بایەزیدی نووسراوەتەوە. لە کۆتاییشدا، لە بەشی پێشەوەی کتێبی ( جامع یی رسالیان و حکایتان)دا، کە لە ١٨٦٠دا لە سانت پیترسبۆرگ چاپکراوە، پێشەکییەکەی م. م. بایەزیدی لەبارەی کتێبەکەی عەلی تەرەماخی، بە کوردی و فەرەنسی بلاودەکاتەوە. ( ٣) دەسنووسە بنجییەکەش ( واتە کتێبەکەی تەرەماخی و پێشەکییەی بایەزیدی) کە بە خەتی بایەزیدی نووسراوەتەوە، ئێستا، لە کتێبخانەی ئەکادیمیای زانستیی رۆژهەلاتناسیی لینینگراد پارێزراوە . ناونیشانی دەسنووسەکە بە فەرەنسی ئەمەیە: Gramaire kurde par Ali Teramakhi offert a l Academie Imperial des Sciences a St-Petersbourg, par A.JABA.

بۆ یەکەمین جار، پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار لە گۆڤاری دەفتەری کوردەواری دا، ژمارە ٣، لە مانگی نیسانی ١٩٧٠دا، لە لاپەڕە ١٤٢ ـ ١٤٤دا، وتارێکی بە ناونیشانی ( عەلی تەرەماخی و دەسنووسەکەی) لەبارەی ئەم دەسنووسەی عەلی تەرەماخی یەوە نووسی. پاشان لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧١، لە چاپخانەی دار الزمان، بە ناونیشانی " دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی ی عەلی تەرەماخی" چاپی کرد. پاشان، ناواخنی

ئەم کتێبەی عەلی تەرەماخی، لە کتێبێکی دیکەدا، لەلایەن رەشید فندی یەوە، بە ناونیشانی ( عەلی تەرەماخی، ئێکەمین رێزمان نڤیس و پەخشان نڤیسێ کورد) لە هەولێر لە ١٩٨٥دا چاپکرا.

ئێستەش، ئێوە و پێشەکییەکەی م. م. بایەزیدی کە بۆ کتێبەکەی تەرەماخیی نووسیوە:

ژێدەر:
١-
Alexandre JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860.
٢- مینۆرسکی Minorsky لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا، کە بە زمانی ئینگلیزی لە ١٩٢٧دا لە لەندەن چاپکراوە، لە بەرگی دووەم، لە لاپەڕە ١٣٠ـ ١٣٥دا، دەڵێ: " عەلی تەرەماخی لە ١٥٩١دا لەدایک بووە ".
٣- سەرچاوەی یەکەم

**پاشکۆیەك لەپێناو سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژووی چیرۆکی کوردی**

# کرنۆلۆژیای چیرۆکی کوردی
# ١٨٥٦ ـــ ١٩٣٩

ئەم کرۆنۆلۆژیایەی خوارەوە، کە وەک پاشکۆیەک، بۆ مێژووی سەرهەڵدانی چیرۆکی کوردی سازمان کردووە ـ هەر لە چووزەرەی یەکەم چیرۆکەوە لە ساڵی ١٨٥٦دا تاکو بڵاوبوونەوەی گۆڤاری گەلاوێژ ١٩٣٩ـ یارمەتیمان دەدات بە چاوێکی تازەی رەخنەگرانەوە بە نووسینەوەی مێژووی چیرۆکی کوردیدا بچینەوە؛ هەروەها یارمەتیمان دەدات کە هەموو ئەو مێتۆدانەی پێشووی " لێکۆڵینەوە لە چیرۆکی کوردی" رەفز بکەینەوە کە تەنیا لە سنووری تەسکی کوردستانی عیراقدا پەنگیان خواردبوو، نەیاندەتوانی جموجۆڵی چیرۆک لە دەرەوەی عیراقدا ببینن. ئەم کرۆنۆلۆژیایە، وامان لێدەکات بە مێتۆدێکی نیشتیمانی و فراوان، سەرلەنوێ دەست بکەینەوە بە لێکۆڵینەوەی مێژووی چیرۆکی کوردی. ئەمەش لەبەرئەوەی، لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی لێکۆڵینەوەکانی پێشووی تۆژەراندا ـ لە ساڵانی حەفتا و هەشتاکاندا ـ بەشێکی فراوانی کەرەستە و سەرچاوەکانی چیرۆکی کوردی نەدۆزرابوونەوە. دڵنیام تا کاتی بڵاوبوونەوەی ئەم چەند دێڕەش، زۆربەی تۆژەر و خوێنەرانی کورد ئاگایان لە بەشێکی فراوانی ئەم کەرەستانە نیە کە لێرەدا تۆمار کراون. بۆیە ئەم کرۆنۆلۆژیایە، لە هەمان کاتدا، بە بیبلیۆگرافیایەکی تازە دەژمێردرێت بۆ چیرۆکی کوردی.

چەند تێبینیەک لەبارەی ئەم کرۆنۆلۆژیایە:

١ـ خۆمان لە هەموو ئەو جۆرە تێکستانە پاراستووە کە پەخشانێکی گێڕانەوەیین Prose Narrative یان نموونەی پەداگۆگین و بۆ فێربوونی زمانی کوردی نووسراون؛ ئەمەش چونکە ئەو تێکستانە بایەخێکی ئەدەبیی ئەوتۆیان نیە. بۆ نموونە: چەند تێکستێکی گێڕانەوەیی Narrativ لە لاپەڕە ٦٢ ـ ٧٤دا لە شێوەی گفتوگۆی نێوان دوو پیاوی گوندنشینی کورد، لە کتێبەکەی کوردناسی ئیتاڵی، گارزۆنی GARZO-NIدا بڵاوکراونەتەوە. تێکستەکان بە زمانی کوردی ( دیالێکتی کرمانجی) نووسراون و تەرجەمەی ئیتاڵیش کراون. کتێبەکە ٢٨٧ لاپەڕەیە لە رۆما لە ساڵی ١٧٨٧ چاپکراوە. بریتیە لە کورتەیەکی رێزمانی کوردی و فەرهەنگێکی ئیتاڵی ـ کوردی. لە دووو توێی لاپەڕەکانیدا هەندێ رستە و دەستەواژەی کوردی تەرجەمەی ئیتاڵی کراون، بەتایبەتیش لە لاپەڕەکانی٦٢ ـ ٧٤دا. ئەم تەرجەمانە بۆ روونکردنەوەی رێزمانی کوردی بوونە بۆ ئیتاڵییەکان. تێکستەکان بایەخێکی ئەدەبیی ئەتۆیان نیە. (١)

٢ـ مەولوودنامە و عەقیدەنامە، سەبارەت بەوەی کە رەگەزێکی سەربەخۆ و جیاوازن، هەروەها لەبەرئەوەی زۆربەیان لە عەرەبییەوە تەرجەمە کراون، نەخراونەتە خانەی چیرۆکەوە. (٢)

٣ـ تەنیا ئەو چیرۆکانە لێرەدا تۆمار کراون کە بە پەخشانن یان تێکەڵ شیعر و پەخشان. ئەو چیرۆکانە تۆمارنەکراون کە بە شیعر نووسراون: چونکە دەچنە خانەی شیعرەوە نەک چیرۆک، واتە خانەی شیعری درامی و شیعری چیرۆک ئامێز و بالاد و داستان.

٤- تێبینی ئەوە دەکەین کە زۆربەی تێکستەکانی سەدەی نۆزدەهەم بە هاندانی کوردناسە ئەورووپاییەکان کراون، هەر لەناو ئەوانیشدا دەستاودەست کراون: بەڵام ئەم دیاردەیە ناتوانێ ئەو راستییە رەش بکاتەوە کە ئەم تێکستانە - وەک دەیان دەسنووسی دیکەمان کە هەر ئەوان پاراستوویانە - ئەمڕۆ، بە گەنجینەیەکی نەتەوەییمان دەژمێردرێن.

هاوینی ١٨٥٦

" مەم و زین، نووسراوی مەلا مەحموودی بایەزیدی" (٣)

بە دیالێکتی کرمانجی، بە دەسخەتی م. م. بایەزیدی، پاشان لە لایەن ژاباوە خراوەتە سەر ئەلفابێی لاتینی و تەرجەمەی فەرەنسی کراوە، لەگەڵ پێشەکییەک بە زمانی فەرەنسی بە پێنووسی ژابا. (٤)

١٨٥٧
'' چیرۆکەکانی ئەحمەد خان''
ئەحمەد خانی چوارەمین پاشای میرنشینی بابان لە کۆتایی ساڵی ١٨٥٣دا سەری لە پاریس داوە و میوانی رۆژهەڵاتناس، خۆدزکۆ CHODZKO بووە. لەو میواندارییەدا، لە ماوەی ساڵی١٨٥٤دا، چەند چیرۆکێکی بە زمانی کوردی بۆ خۆدزکۆ نووسیوە و لە ساڵی ١٨٥٧دا لە شێوەی نامیلکەیەکدا بڵاوکراونەتەوە. خۆدزکۆ لە پێشەکیی ئەو نامیلکەیەکەیدا نووسیویەتی:'' ئەگەر رێککەوت ئەحمەدخانی بۆم نەهێنایەتە پاریس، لێکۆڵینەوەکەم ئەم بەرهەمەی ئێستای لێ نەدەهاتە ئەنجام''، '' دووای ئەوەی لە مانگەکانی ١٨٥٤دا کارەکانمان تەواوکرد، ئەحمەدخان لە ئەستەمبۆڵەوە نامەی بۆ هات و بانگهێشتکرا کە پاریس جێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ ئەستەمبۆڵ''. (٥)
بەشی دووەمی ئەم کتێبە شەست لاپەڕەییەی خۆدزکۆ، وەک پاشبەندێک وایەکە بریتییە لە دە تێکست و چیرۆک بە زمانی کوردی، وێڕای وەرگێڕانە فەرەنسییەکەیان و شیکردنەوەی یەکە یەکەیان. ئەم دە تێکستە بچکۆڵە کوردییە بە قەڵەم و دەسخەتی ئەحمەد خانی چوارەمین پاشای میرنشینی بابان نووسراونەتەوە و بە یەکێک لە یەکەمین چیرۆک و پەخشانە کوردییەکان دەژمێردرێن.

١٨٥٩
'' لەیلا و مەجنوونی مەلا مەحموودی بایەزیدی''
مەلا مەحمودی بایەزیدی: چیرۆکی لەیلا و مەجنوون Legende Kurde ، بە دیالێکتی کرمانجی، بە دەسنووسی خۆی نووسراوە. پاشان لە لایەن ژاباوە خراوەتە سەر ئەلفابێی لاتینی و تەرجەمەی فەرەنسی کراوە، لەگەڵ پێشەکییەک بە زمانی فەرەنسی بە پێنووسی ژابا. چڵێکی ئەم دەسنووسە، لە کتێبخانەی لانگزۆ INALCO لە پاریس، هەروەها چڵێکی تریشی لە نامەخانەیەکی پێترسبۆرگ لە رووسیا پارێزراون.
لە فرۆکەخانەی ئەنقەرە نوسخە کۆپیکراوەکەی ئەم دەسنووسە کوردییە دانسقەیان لێم حەجز کرد، پاشان لەپێش چاوم، وێڕای دەیان کەرەستەی دەگمەنی دیکەی کوردی، سووتاندنیان. بەڵام ئەوەی باش بوو کە پێشتر، لە ساڵی ١٩٩٢دا، لە پاریس، چڵێکی کۆپێکراوم لەم دەسنووسە پێشکەش بە مامۆستای هێژام، ئۆردیخانی جەلیل، کردبوو بۆئەوەی ئەویش لای خۆی کاری لەسەر بکا.

١٨٦٠
چل چیرۆکی مەلا مەحموودی بایەزیدی بە ناونیشانی '' جامع الحکایت''
مەلا مەحمودی بایەزیدی: جامع یی رسالیان و حکایتان Recueil de Notices et Recits kourdes، چل چیرۆکی کوردییە بە دیالێکتی کرمانجی. ئەم بەرهەمە، کە دەبێتە یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی بە کتێب چاپکراو لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، لەلایەن ئەلکساندەر ژاباوە تەرجەمەی فەرەنسی کراوە و هەر خۆیشی لە ساڵی ١٨٦٠دا لە سانت پیترسبۆرگ بە زمانی کوردی و فەرەنسی لەگەڵ پێشەکییەک بە پێنووسی پ. لێرخ بڵاوی کردۆتەوە. (٦)

١٨٦٠
چیرۆکی سیابەند و شەمسێ
مەلا مەحمودی بایەزیدی: چیرۆکی سیامەند و شەمسی، بە پەخشان، بە دیالێکتی کرمانجی. نووسراوی بایەزیدییە و ژابا کردوویەتییە فەرەنسی.
لەبارەی ئەم دەسنووسەوە، رۆژهەڵاتناسی رووس، چیخاچیێف، دەڵێ:'' لەنێو ئەو بەڵگەنامانەدا کە چەندین رەفەی کتێبخانەکەی ئەلکساندەر ژابا ( ئەو کونسوڵە زانایەیان) پڕکردبۆوە، داستانی خۆشەویستیی سیامەند و شەمسێ مان بەرچاو دەکەوێت. بەڕێز ژابا نەک تەنیا وەرگێڕدراوی کوردی و تا رادەیەک بە شێوازێکی ئەدەبێیی داڕێژراوی ئەو داستانەی دامی، بەڵکو کۆپییەکی جوانی دەقەکەیشی پێبەخشیم و رێگای ئەوەی دامێ کە بیدەم بە ( کۆمەڵەی ئاسیاویی فەرەنسا ) کە بێگومان دڵشاد دەبێت کە خۆی بە ئاسەوارێکی وا دانسقەی ئەدەبی رۆژهەڵات دەوڵەمەند بکات''. (٧)
چیخاچیێف ئەم دەسنووسە کوردییەی لەگەڵ وەرگێڕدراوە فەرەنسییەکە و نووسینەوەی بە پیتی لاتینی، لەگەڵ پێشەکییەک بە زمانی فەرەنسی لە ساڵی ١٨٥٩دا بڵاوکردۆتەوە . (٨)

١٨٨٧
چیرۆکەکانی ئەلبێرت سۆسین و یۆژێن پریم
ئەلبێرت سۆسین بە هاوبەشیی پریم، دوو بەرگ کتێبیان بە ناونیشانی کەشکۆڵی کوردی لە ماوەی ساڵانی ١٨٨٧ ـ ١٨٩٠دا لە سانت پیترسبۆرگ بڵاوکردۆتەوە، گەلێ چیرۆکی فۆلکلۆری و داستانی کوردی بە وەرگێڕانی ئەڵمانییەوە تێدایە. لەناو ئەو چیرۆکانەدا، لاپەڕە ٩٩ تا ٢٧١ بریتییە لە چیرۆکی مەم زین. پاشان پێکەوە لە ساڵی ١٨٩٨ ـ ١٩٠١ لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانییان لەسەر ئەم تێکستانە نووسیوە و بڵاوکردۆتەوە. (٩)

١٨٩٩

" محەببەتێ مەم و زین"، کۆکراوەی هارتمان.

مەم و زین، بە پەخشان و شیعرە، بە دیالێکتی کرمانجی. ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی، مارتن هارتمان Martin HARTIMANN (١٨٥١ ـ ١٩١٩) کۆی کردۆتەوە و لەگەڵ چەند بەیتێکی دیکەی کوردی لە ١٨٩٩ نووسراونەتەوە. ئێستا لە نامەخانەی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی ئەکادیمیای زانستیی " سۆڤیەت" لە لینینگراد پارێزراون ئەم ژمارەیان پێ دراوە لە ڕیزی دەسنووسەکانی تر: B2514.

ئەم چیرۆکە بە شیعر دەست پێدەکات، دەبێتە پەخشان و دووبارە شیعر، بەم جۆرە تا بە پەخشان کۆتایی دێ. نزیکەی سێزدە لاپەڕەیەک دەبێت. (١٠)

١٩٠٣

هەشت داستان و دوازدە حەکایەتەکەی لۆکۆک .

کوردناسی ئەڵمانی لۆکۆک، کتێبێکی دوو بەرگیی، لە ساڵی ١٩٠٣دا لە بەرلین بڵاوکردۆتەوە کە پڕە لە تێکستی جۆراوجۆر بە زمانی کوردیی دیالێکتی کرمانجی. بەرگی یەکەم ٧٢ لاپەڕەیە، بەرگی دووەم ١١٨ لاپەڕەیە. نووسەر لە بەرگی یەکەمدا بیست چیرۆکی کرمانجیی بە پیتی عەرەبی و لاتینی، بە تەرجومەی ئەڵمانییەوە لە لاپەڕە ١ تا ٧٢ بڵاوکردۆتەوە. شایانی باسە هەندێکیانی ناوناوە حەکایەت و هەندێکی دیکەی ناوناوە داستان؛ هەشت داستان و دوازدە حەکایەتن.

بەرگی دووەمی کتێبەکە بریتیە لە ترانسکریپسیۆنی چیرۆک و تێکستە کوردییەکان بە پیتی لاتینی، هەروەها لە لاپەرە ٧٠ تا ١١٨دا فەرهەنگۆکێکی بۆ وشە گرانەکان کردووە، بەم شێوەیە: زازایی ـ کوردیی بابانی ـ ئەڵمانی. ئەم داستان و حەکایەتانەی، لەسەر زمانی پێنج مەلا و فەقێی گوندنشینی کوردستانی تورکیاوە وەرگرتووە. (١١)

١٩٠٥

بەیتەکانی ڕەحمان بەکر

ئۆسکارمان، کوردناسی ئەڵمانی، لە ماوەی ساڵانی ١٩٠٣ ـ ١٩٠٤ لە کوردستان بووە. لە مەڵبەندی مهاباد لەسەر زمانی ڕەحمان بەکر گۆیندە ناوێکەوە چەندین بەیت و چیرۆکی کوردیی بە شیعر و پەخشان تۆمارکردووە و لە بەرلین لە ساڵی ١٩٠٥ بە چاپی گەیاندووە. بەیتەکان ئەمانەن: قەڵای دمدم، مەم و زین، لاس و خەزاڵ، جوڵەندی، لەشکری، زەمبیل فرۆش، ناسر و ماڵماڵ، شێخ فەرخ و خاتوو ستی، قۆچ عوسمان، باپیر ئاغای مەنگوڕی، عەلی عاشق. (١٢)

کتێبی ناوبراو بە ناوی توحفەی مظفریە وە لەلایەن هێمنی موکریانییەوە هەڵگێڕدراوەتە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆی کوردی و لە بەغدا لە ١٩٧٥ لەلایەن کۆڕی زانیاریی کوردەوە چاپکراوە.

١٩١٣

لە ژمارە ١و٢ی گۆڤاری ڕۆژی کورد لە ئەستەمبۆڵ ساڵی ١٩١٣، زاراوەیەکی ئەدەبیی تازە، کە واتای ژانرێکی ئەدەبیی نوێ دەگەیەنێ لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا سەری هەڵدا: چیرۆک. لێرە بەملاوە " چیرۆک" وەک ژانرێکی تازە، ناوێک بۆ خۆی وەردەگرێت و دەچەسپێت و بڵاودەبێتەوە.

ئەم یەکەمین " چیرۆک"ە ، بە پێنووسی فوئادی تەمۆ نووسراوە و لە ژمارە ١و٢ی گۆڤاری ڕۆژی کورد لە ئەستەمبۆڵ ساڵی ١٩١٣دا بڵاوکراوەتەوە. هەرچەند کورتە و تەواویش نەبووە، بەڵام سیستەمی دەرەبەگایەتی دەخاتە ژێر پرسیارەوە. لە ڕووی هونەریشەوە، دیالۆگ و مەنەلۆگ و گرێ و شیکردنەوەی سۆز و ئەندێشەی پاڵەوانی تێدایە. جگە لەوەش بەپێچەوانەی حەکایەت و هەبوو نەبوو، کاتی ئێستای بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکان بەکارهێناوە.

لە هەمان ساڵ و گۆڤاردا، لە ژمارە (٣)، بە پێنووسی (کندۆ) ناوێک، ( چیرۆکا کرمانجا ) بڵاوکراوەتەوە.

١٩١٨ ـ ١٩١٩

سێ چیرۆکی کوردی بە زمانی تورکی لە گۆڤاری ژین

سێ چیرۆک لە ساڵی ١٩١٨ ـ ١٩١٩ لە ئەستەمبۆڵ لە گۆڤاری ژین ژمارە ( ٤)، ل ٩ـ ١٢ و ژمارە ( ٦)، ١١ ل٨ ـ ١١ بڵاوکراونەتەوە. هەر سێکیان ژیانێکی کوردی دەردەبڕن و پاڵەوانەکانیان کوردن، بەڵام بە زمانی تورکی نووسراون. یەکێکیان عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری نووسیویەتی.

١٩٢٠

چیرۆکی ژیانی پێغەمبەران

زیوەر: لە کتێبی قصص الانبیادا، کە لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٢٠دا چاپی کردووە، چیرۆکی ژیانی ئەم پێغەمبەرانەمان بۆ دەگێڕێتەوە: نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا، محەمەد د. خ). سی لاپەڕەیە.

١٩٢٠

چیرۆکەکانی مێجەرسۆن

چیرۆکە بڵاوکراوەکانی نێو ڕۆژنامەی پێشکەوتن لە سلێمانی لەنێوان ساڵانی ١٩٢٠ ـ ١٩٢٢دا، کە بەشێکیان لە نووسراوی مێجەرسۆنن، لە ژمارەکانی ٤ و ٥ و ٦ و ٧ و ٨ و ٩ و ١٠ و هتد بڵاوکراونەتەوە؛ هەوڵدانێکن بۆ لە چوارچێوەگرتنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئەوسات. دیالۆگ و مەنەلۆگ و وەسفی شەخسیات و دەوروبەر لە هەموو ئەم چیرۆکانەدا بەکارهاتوون. بە گەوێکی گرنگ لە نەشونمای چیرۆکی

کوردی دەژمێردرێن.

١٩٢١ ـ ١٩٢٢
چیرۆکە تەرجەمەکراوەکانی مێجەرسۆن
لە ١٩٢١ بەملاوە، لەسەر لاپەڕەکانی رۆژنامەی پێشکەوتن لە سلێمانی، یەکەمین تەرجەمەی چیرۆکە بێگانەکان بۆ کوردی دەردەکەون، بەتایبەتی لەلایەن مێجەرسۆنەوە.
مێجەرسۆن، سەرنووسەری رۆژنامەی پێشکەوتن لە سلێمانی، کە کولتوورێکی ئەورووپی هەبووە و ئەم هونەرەی بە لاوە گرنگ بووە، ویستوویەتی نووسەرانی کوردیش پەیڕەوی بکەن و لاسایی بکەنەوە؛ بۆیە چەندین چیرۆکی تەرجەمە کردووە لە ئینگلیزییەوە، گرنگترینیان:
١ـ نات پینکرتۆن، کورتە رۆمانێکی پۆلیسیی ئینگلیزییە، لە ژمارە ٥٩ تا ٧٩ ساڵی ١٩٢٢.
٢ـ لە ماڵی کوێخا ئەرتیفای، کورتە رۆمانێکە، نووسینی: رۆماننووسی فەرەنسی، ئەلکزەندەر دووماس، لە ژمارە ٤٨ تا ٩٩ی ساڵی ١٩٢٢.
٣ـ هەروەها چەندین چیرۆکی وەرگێردراوی تر لە ژمارەکانی ٤١ و ٤٢ و ٥٤ و ٥٥؛ لەگەڵ چیرۆکی گەشتەکەی مستەر ریچ کە بە زنجیرە بلاوکراونەتەوە.
بەم شێوەیە، مێجەرسۆن کە بە یەکەم وەرگێڕی چێرۆک بۆ سەر زمانی کوردی دەژمێردرێت.
لە هەمان کاتدا، مێجەرسۆن هانی چیرۆکنووسانیشی دەدا: لە یەکێک لە ژمارەکانی پێشکەوتن پێشبڕکێیەکی دانا بۆ ئەو نووسەرانەی کە بە پاکترین و پەتی ترین کوردی دەنووسن؛ سێ خەلاتیشی تەرخانکرد بۆ سێ نووسەری براوە، کە جەمیل سائیب و شێخ نووری بەریان کەوت.

١٩٢٢ ـ ١٩٢٥
چەند هەوڵدانێکی دیکەی حامید فەرەج، ئەحمەد حەمدی، زێوەر، لاوانی کورد، فازیل تاڵەبانی، حەسەن تاڵەبانی... چەند چیرۆکێک لە بانگی کوردستان ( سلێمانی ١٩٢٢ و ١٩٢٦)، ژیان ( سلێمانی ١٩٢٦ـ ١٩٣٨)، ژیانەوە ( سلێمانی ١٩٢٤ ـ ١٩٣٤)، رەوشت و خوو، بلاودەکەنەوە. هەروەها هەندێک هەوڵدانی دیکە لەسەر لاپەڕەی بلاوکراوەکانی وەک: ئومێدی ئیستیقلال ( سلێمانی ١٩٢٣)، دیاری کوردستان( بەغدا. ١٩٢٥)، لەگەڵ ئەوەی کەریم بەگی سەعید بەگی زانستی: بۆچی جل خوارم، لە رۆژنامەی ژیانەوە، لە ١٦ی شوباتی ١٩٢٥.

١٩٢٥
یەکەم نۆڤلێتی کوردی
لە رۆژی ١/ ٧ /١٩٢٥ لە ژمارە ٢٩ی رۆژنامەی ژیانەوەدا تا ژ مارە ٢٦ هەروەها پاشان لە ژمارە ١ی رۆژنامەی ژیان ( ٢٩/ ٧/ ١٩٢٦) تا ژمارە ٢٦، لە سلێمانی، یەکەم نۆڤلێتی کوردی بە زنجیرە بە ناونیشانی (لەخەوما) بە قەڵەمی جەمیل سائیب ( ١٨٨٧ـ ١٩٥٠) بلاودەکرێتەوە. جەماڵ بابان لە ١٩٧٥ لە ٩٥ لاپەڕەدا بلاوی دەکاتەوە.

١٩٢٦
یەکەم جار چیرۆکنووسێکی کورد، بۆ خۆی، کۆمەڵە چیرۆکێکی خۆی بلاو دەکاتەوە:
١ـ عیسا عەلی ( حوسێن حوزنی موکریانی ؟): چیرۆک بە شێوەی شیمال ( کەڵەکۆک)، رواندز، ١٥ لاپەڕە. کەڵەباب.
٢ـ حوسێن حوزنی موکریانی: خۆشی و ترشی، کورتە چیرۆکێکە بۆ منداڵان، گفتوگۆیەکە لەنێوان گورگ و مەڕ و بزنێک ( یەکەم چیرۆکە کە بۆ منداڵان نووسرابێت لە ئەدەبی کوردیدا)، رواندز، ٢٢ لاپەڕە. زاری کرمانجی لە ژ ١٠ دا دیعایەی بۆ کردووە.
ـ س. ح. ( حسێن حوزنی موکریانی): چیرۆک، گۆڤاری زاری کرمانجی، ژمارە ( ٣).
ـ حسێن حوزنی موکریانی:تەخت هەقی کێیە، گۆڤاری زاری کرمانجی، ژمارە ( ٥).
ـ مستەفا پاشای یامولکی: سەرگوزەشتەیەکی خۆش، بانگی کوردستان، ژمارە ( ١٤).
ـ آ: حەکایەت، رۆژنامەی ژیان، ژمارە ( ١٠).

١٩٢٧
ـ حسێن حوزنی موکریانی: چیرۆک، گۆڤاری زاری کرمانجی، ژمارە ( ٨).
ـ م . ا : خاتیرات، رۆژنامەی ژیان، ژمارە ( ٦١)، سلێمانی: ١٩٢٧.

١٩٢٨
– دووەم نۆڤلێتی کوردی، بە ناونیشانی مەسەلەی ویژدان، نووسراوی ئەحمەد موختار بەگی جاف.
– زاری کرمانجی، ژ ٧ و ٨ و ١١: دیالۆگی تێدایە بە زنجیرە بە ناونیشانی دەردی دەروون.
– زاری کرمانجی، لە ژمارە ١٢، لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ١٩٢٨دا، پڕۆپاگاندەی بۆ کۆمەڵە چیرۆکێکی تر کردووە بە ناونیشانی ( ترازان)، نووسیویە دەڵێ:
( ترازان)سەد و یازدە سەربهوردی واقیعییە نەک خەیاڵی لەسەر لەهجەی شیمال. بە مناسەبەتی هەر سەربهووردێ رەسمێکی تێدایە، بۆ لاوانی مەکتەب زۆر بەکەڵک و باشە. لە نەشریاتی زاری کرمانجی. ل ١٦.
– زاری کرمانجی، لە ژمارە ١٢، لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ١٩٢٨دا، پڕۆپاگاندەی بۆ کۆمەڵە چیرۆکێکی تەرجەمەکراو کردووە بە ناونیشانی ( خیوەی رازان)، کە

دەبێتە یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی تەرجەمەکراوی بە کتێب چاپکراو؛ نووسیویە دەڵێ: خیوەی رازان کتێبێکی سەد و چل حیکایەتی خەیاڵییە نەک واقیعی لەسەر لەهجەی جنوبییە. بە مناسەبەتی هەر حیکایەتێ رەسمێکی تێدایە، لە طەرەف میرزا حەسەن کوردستانی تەرجەمە و رێکخراوە. ئەسەرێکی گەلەک چاک و بە قازانجە بۆ لاوانی رێزی ٤ و ٥م. ل ١٦.

١٩٣١

دووەم چیرۆکی تەرجەمەکراو کە بە کتێب بڵاکرابێتەوە: سەرهاتیا جاسم. حاجی جندی و ئەمینێ عەڤداڵ لە نووسینێکی لازۆ ی ئەرمەنییەوە، لە ئەرمەنییەوە کردوویانەتە کوردیی کرمانجی، بە پیتی لاتینی، لە یەریڤان لە ٣٢ لاپەڕەدا بڵاوکراوەتەوە.

١٩٣٢

ـ زمنامەیێ کرمانجی

خاچاتریان نووسیوبەتی. چەند داستانێکی کوردەوارییە لەژێر ئەم ناوانەدا: حەفت کۆسە، مەحموودێ نێچیرڤان، عوسمانێ پاڵەوان، ئەسەدێ دەڤدار. بە دیالێکتی کرمانجی، بە پیتی لاتینی، لە یەریڤان لە ٣٩ لاپەڕەدا بڵاوکراوەتەوە.

١٩٣٢/٥/١٥ ـ ١٩٣٥/٨/١٥

ـ بڵاوبوونەوەی ٢٦ ژمارە لە گۆڤاری هاوار ( ١٩٣٢ ـ ١٩٣٥ ): " قۆناغی یەکەم. لە سەروتاری ژمارە (١)ی گۆڤاری هاواردا بە ناوی " ئارمانج" رادەگەیەنرێت کە بایەخی سەرەکی بە هونەری چیرۆک دەدرێت. زاراوەکانی: کورتە چیرۆک، چیرچیرۆک، چیرۆکی مێژوویی، چیرۆکنڤیس، چیرۆکبێژ... دادەتاشرێن و لەرێگەی گۆڤاری هاوارەوە بڵاودەبنەوە. هەروەها ٣٧ چیرۆکی کوردی لە گۆڤاری هاواری ئەم قۆناغەدا بڵاودەکرێنەوە. جگە لە چیرۆکە فۆلکلۆری و ئامادەکراوەکان. (١٣)

– چەندین چیرۆکنووس دەردەکەون، لەوانە: کامەران بەدرخان ( ٨ چیرۆک بڵاودەکاتەوە)، جەلادەت بەدرخان ( ٧ چیرۆک بڵاودەکاتەوە)، مستەفا ئەحمەد بۆتی (٦ چیرۆک بڵاودەکاتەوە). دەرکەوتنی چەند چیرۆکنوسێکی دیکە: عوسمان سەبری، قەدریجان، جگەرخوێن... کە هەر یەکەیان چەند چیرۆکێک بڵاودەکەنەوە. ئەم نەوە چیرۆکنووسە تازەیە کاریگەرێتیی خۆی بەسەر چیرۆکنوسانی کوردستانی عیراق دەنوێنی، بەتایبەتیش بەسەر پێگەیاندنی عەلائەدین سەجادی و شاکیر فەتاح و ئیبراهیم ئەحمەد. کوردناسی فەرەنسی، رۆژە لەسکۆ، ناو لەم جموجۆڵەی گرنگی چیرۆکی کوردی دەنێت " قوتابخانەی دیمەشقی" لە چیرۆکی کوردیدا. (١٤)

١٩٣٣

ـ حکیات دەرحەق عیسا. ر. درامبیان، لە نووسینێکی ( ئامۆسۆف) ی رووسەوە کردوویە بە کرمانجی. چەند چیرۆکێکی ئاینییە لەبارەی عیسا. لە ٣٤ لاپەڕەدا، ساڵی ١٩٣٣ لە یەریڤان چاپکراوە.

– کوردی و مەریوانی بە ناوی ( ک ) و ( س. ف) لە یادگاری لاواندا دوو چیروکیان بە ناوی ( کردەوەی دەروێش) و ( مام ورچ) بڵاوکردۆتەوە.

ـ تەرجەمەی یەکەم چیرۆکی بە کتێب چاپکراو بۆ منداڵان: شاکیر فەتاح چیرۆکێکی بە ناونیشانی خانووی تازە لە نووسینێکی کامل گیلانی یەوە کردۆتە کوردی، لە ٢٠ لاپەڕەدا لە سلێمانی بڵاوکراوەتەوە.

ـ پیرەمێرد: ئاواتی دڵ یان گەشتێ بەسەر باڵی پەڕەندەی خەیاڵەوە، ژیان، ژمارە ٣٣٥ تا ٣٥٧.

ـ پیرەمێرد: دوانزە سوارەی مەریوان، ژیان، ژمارە ٣٦٦ تا ٣٦٧.

١٩٣٤

ـ پیرەمێرد: مەم و زین، داستانێکە بە شیعر و پەخشان، لە ٢٢ لاپەڕەدا لە سلێمانی لە چاپخانەی ژین چاپکراوە.

ـ محەمەد عەلی کوردی: دووای سەرخۆشیی زۆر شێتییە، دیاری لاوان، بەغدا.

ـ یەکەم کتێبی چاپکراوی تەرجەمە لە چیرۆکی ئینگلیزییەوە: جۆنی و جەمیمە، ناونیشانی چیرۆکێکە کە جەلادەت بەدرخان لە ئینگلیزییەوە کردوویەتیە کوردی و لە شام لە ٣٦ لاپەڕەدا چاپی کردوە.

ـ تەرجەمەکردنی چەند چیروکێکی سۆڤیەتی: جاسمێ جەلیل کۆمەڵە چیرۆکێکی سۆڤیەتیی ئەوسای بە ناونیشانی سوورا سەفەرێ کردۆتە کوردی و لە یەریڤان، لە ٢٤ لاپەڕەدا چاپکراوە. وێنە بۆ چیرۆکەکان کێشراوە.

١٩٣٥

ـ نۆڤلێتی شڤانێ کورد، عەرەبی شەمۆ نووسیوبەتی، لە ١٥٥ لاپەڕەدا لە یەریڤان چاپکراوە.

ـ دووەم کۆمەڵە چیرۆکی چاپکراوی منداڵان:" چیرۆک بۆ منداڵان"، شاکر فەتاح نووسیوبەتی و لە بەغدا لە ٥٠ لاپەڕەدا بە وێنەوە بڵاوی کردۆتەوە.

ـ کراستاپۆر کۆلۆمبس. ر. درامبیان ئەم چیرۆکەی لە ئەدەبیاتی سۆڤیەتییەوە کردۆتە کوردی و لە ٣١ لاپەڕەدا لە یەریڤان چاپکراوە. گەشتەکەی کۆلۆمبس بە وێنەوە دەگێرێتەوە.

ـ پیرەمێرد: دوانزە سوارەی مەریوان، سلێمانی.

– رەشۆ ( حوسێن حوزنی موکریانی): فاتم چونکە زاڵم بوو ئاخیریماڵی کاول بوو، رووناکی، ژمارە ( ٣ )، هەولێر.

ـ گوڵلەیەک لە تاریکیدا، رۆمانێکی سەدەی نۆزدەهەمە، کوردی و مەریوانی وەریانگێراوە، لە ٤٠ لاپەڕەدا لە

بەغدا بڵاکراوەتەوە.

١٩٣٦
ـ تەرجەمەی دوو چیرۆکی منالاَن و دوو چیرۆکی دیکە.
١ـ رۆبنسۆن، وەرگێڕانی: جەردۆی گەنجۆ، ٧٥ لاپەڕە، یەریڤان
٢ـ تەیر و توو، وەرگێڕانی: جاسمێ جەلیل، رەنگاوڕەنگ، ١٦ لاپەڕە، یەریڤان.
ـ چیرۆکی خووەیی و خولام، وەرگێڕانی: جاسمێ جەلیل، رەنگاوڕەنگ، ١٢ لاپەڕە، یەریڤان.
ـ رۆمانی سمانتۆ و خەجێ زەری، وەرگێڕانی: جاسمی جەلیل و ر. درامبیان، ٣٢ لاپەڕە، یەریڤان.
ـ ئەحمەد حەمەسور: سەرگزەشتە، ژیان، ژمارە ٤٦٥.
ـ یونس مستەفا عومەر: پاشایەکی دادپەروەر، گۆڤاری رووناکی، ژمارە (٨)، هەولێر.
ـ یونس مستەفا عومەر: قیمەتی نالێک، گۆڤاری رووناکی، ژمارە (٩)، هەولێر.
ـ پیرەمێرد: مەحموود ئاغای شێوەکەل، سلێمانی.
ـ محەمەد عەلی کوردی: رۆمانی نیوەچلی (نازدار یان ژنی کورد لە لادێ)، رووناکی، ژمارەکانی (٧ و ٩ و ١١) هەولێر.
ـ حوسێن حوزنی موکریانی: هەرچی دەکەی دووامینی رەچاو کە، رووناکی، ژمارە (١)، هەولێر.

١٩٣٧
ـ تەرجەمەی دوو چیرۆکی رووسیی سەدەی نۆزدەهەم:
١ـ پووشکین: عەفران و حکیات، وەرگێڕانی: ر. درامبیان، ١٣٨ لاپەڕە، یەریڤان
٢ـ تولستۆی، ەرگێڕانی: قاچاغێ موراد، ٥٨ لاپەڕە، یەریڤان.
ـ تەرجەمەی چوار کۆمەڵ چیرۆکی منداڵان بۆ کوردیی کرمانجی کە لە یەریڤان بڵاوکراونەتەوە.
ل ٥١ ـ ٥٢.

١٩٣٨
رۆمانێکی کوردی لەلایەن کامەران بەدرخان: میری کوردستان، بە دیالێکتی کرمانجی، بە پیتی لاتینی، لە ٩٢ لاپەڕەدا.
ئەم رۆمانە، تا ئێستا دەسنووسە و بە کوردی بڵاونەکراوەتەوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٣٨دا لەلایەن نووسەر ـ خوی و نووسەرێکی فەرەنسییەوە بە ناوی ئەدۆلف دو فالگێرۆڵ تەرجەمەی فەرەنسی کراوە و بە ناونیشانی Le Roi Du Kurdistanلە ٨٤ لاپەڕەدا لە پاریس لە دەزگای ئۆرفەریسگاپ بڵاوکراوەتەوە.(١٥) هەمان رۆمان تەرجەمەی ئەڵمانیش کراوە. ئەم رۆمانە کوردییە دەبێتە یەکەم رۆمانی کوردی تەرجەمەی زمانێکی رۆژئاوایی کرابێت.
شایانی باسە، بە ئاگاداریی تۆما بوا، کامەران بەدرخان رۆمانێکی دیکەیشی هەیە بە ناونیشانی هەڵۆی کوردستان L Aigle du Kurdistan، کە ١٤٤ لاپەڕەیە و تا ئێستا ئێمە نەماندیوە. (١٦)

ـ سەعید ناکام: فەرمانی تازە، ژیان، ژمارە (٥٤٦ و ٥٤٧)، سلێمانی.

١٩٣٩
گۆڤاری گەلاوێژ و چیرۆکنووسەکانی... (١٧)

سەرچاوە:
(١)
GARZONI: Grammatica e Vocabulario della lingua Kurda, Rom: 1787.

:(٢)
بڕوانە ئەم دوو سەرچاوەیە:
– شێخ حسێنی قازی: مەولوودنامە، سلێمانی، ساڵی ١٩٣٥.
– محەمەدی مەلا کەریم: عەقیدەنامەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عیراق ـ دەستەی کورد، بەرگی هەشتەم، بەغدا: ١٩٨١، ل ١٩٩ـ٢٢٢.

٣– د. فەرهاد پیربال: مەم و زین، یەکەم چیرۆکی کوردی، گۆڤاری کاروانی ئەکادیمی، ژمارە (١)، هەولێر: ١٩٩٧. هەروەها سەرلەنوێ لە ساڵی ١٩٩٩دا لە گۆڤاری (زانکۆ) کە بڵاوکراوەیەکی ئەکادیمیی زانکۆی سەلاحەدینە لە هەولێر، بڵاوکراوەتەوە. کەواتە بەلای کەمییەوە، چوار پسپۆڕی ئەکادیمیی زانکۆ ئەوەیان پەسەند کردووە کە ئەم چیرۆکە دەبێتە یەکەمین چیرۆکی کوردی.

A. JABA: Resume de l ouvrage d:٤ Ahmed Effendi Khani, Tr. par A. JABA, in Bulletin Hist. Philologique, LXV, 1858, No 11, P. 161-171.

:(٥)

CHODZKO: Etudes philologiques sur la langue Kurde - Dialecte de Suolemanie, in Journal Asiatique, No 4, Paris; 1857. 60 pages.

(٦):

: Alexandre JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: . 1860.

(٧): ب. ئا. چیخاچێیف: ئەو نامانەی سەبارەت تورکیان، بە رووسی، مۆسکۆ: ١٩٦٠، ل ٣٧؛ بڕوانە: ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، رووناکبیری، ژ ٣ ـ ٤، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٣، ل ٢٩ ـ ٤٥.

(٨):

A. JABA: Ballade Kurde recueillie et traduite par A. JABA et communiquee par DE TCHITIATCHEFF in Journal Asiatique, Paris: 1859, 5e Ser., T. XIV, P. 153-166.

(٩):

PRYM Eugen, SOCIN Albert : Kurdische Sammlungen Erzahlugen und Liden in den Dialekten des Tur Abdin und von Bohtan, St Petrsbourg: 1887-1890.

هەروەها بڕوانە: عبيدالله ايوبيان: چريكەی كردی، نشريه دانشكده ادبيات تبريز، شماره تابستان، ١٣٤٠. ( ١٩٦٣).

(١٠):

د. مارف خەزندار: لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، الموسسه العراقيه للطباعه و الدعايه، بەغداد: ١٩٨٤، ل ٣٥١ ـ ٣٧٦.

(١١):

Le Coq: Kurdische Texte, gesammelt und hrsgb, Berlin: 1903.

(١٢):

Die Mundart Der Mukri- Kurden, Kurdische Persische Forchungen, Pr Oskar MANN, Band 111, T 1, Berlin: 1905.

هەروەها بڕوانە: عبيدالله ايوبيان: چريكەی كردی، نشريه دانشكده ادبيات تبريز، شماره تابستان، ١٣٤٠ ( ١٩٦٣).

(١٣):

Pierre RONDOT: Publication Kurde en caracteres latins Hawar, Revue Kurde in Bulletin d Etudes Orientals de l Institut Francais de Damas, T2, 1933, P. 3.

(١٤):

Roger LESCOT: Litterature Kurde, PP. 795-805, in Encyclopedie de la Pleade, Histoire des Litteratures, Vol. 1, ed. Gallimard, Paris: 1977, P. 903.

(١٥):

Emir Kamuran BEDE-RKHAN: Le Roi Du Kurdistan, Roman Epique traduit du Kurde Par Emir Kamuran BEDE-RKHAN et Adolphe de FALGAIROLLE, ed. OPHRYSGAP. Paris: 193?, 84 pages.

(١٦):

Thoas BOIS: Connaissance des Kurdes, Khayat, Beyrouth: 1965, P. 133.

(١٧):

فەرهاد پیربال: چیرۆکەکانی گۆڤاری هاوار، مامۆستای کورد، ژمارە ( ١١ ـ ١٢)، ستۆکهۆڵم: هاوینی ١٩٩١. ل ١٣ ـ ٢٨.

مستەفا نەریمان: بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی، ک. ز. ک.، بەغدا: ١٩٩٧.

کتێبەکانی تری نووسەر:

١-ماڵئاوا ئەی وڵاتەکەم، شانۆنامەی یەک پەردەیی، بڵاوکراوەکانی یەکیەتیی نووسەرانی کوردستان ( شاخ)، ژمارە ( ١٨): ١٩٨٤
٢- بەیانیت باش ئەی غەریبی، شانۆنامەی یەک پەردەیی، بڵاوکراوەکانی بنکەی یەکگرتن، کۆپنهاگن: ١٩٨٨.
٣- Exil شیعر، بڵاوکراوەکانی ئەنستیتووی کورد لە پاریس، ١٩٩٤.

٤- گۆڤاری کوردستان، ئەستەمبۆڵ ( ١٩١٧ - ١٩١٨)، ژمارە ئەسڵییەکان و تۆژینەوەیەک، بڵاوکراوەکانی دەزگای گوڵان، هەولێر: ١٩٩٨.
٥- رۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەرەنسی، بڵاوکراوەکانی گۆڤاری سەنتەری برایەتی ( ژمارە ١)، هەولێر: ١٩٩٨.
٦- سەرچاوەکانی کوردناسی Kurdiligie، تۆژینەوە، بڵاوکراوەکانی بنکەی رووناکبیریی گەلاوێژ، سلێمانی: ١٩٩٨.

٧- وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسە ئەورووپاییەکاندا، بڵاوکراوەکانی وێران، هەولێر: ١٩٩٩.
٨- مانیفێستی دووەمی وێران، سپیباییەکانی ناو رەش رەشاییەکانی ناو سپی، کۆمەڵە شیعر، هەولێر: ١٩٩٩.
٩- زێڕی ناو زبڵ، وەرگێڕانی نووسراوی رۆژهەڵاتناسەکان لەبارەی کورد، لە فەرەنسییەوە، بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم، سلێمانی: ١٩٩٩.
١٠- ئینجیل لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا ( ١٨٥٧ - ١٩٥٧) سەرەتاکانی سەرهەڵدانی پەخشانی کوردی، م. ب. ئاشتی، دهۆک: ١٩٩٩.
١١- ئینجیل د مێژوویا ئەدەبیاتێن کوردیدا، دەسپێکێت سەرهلّدانا پەخشانا کوردی، بنگەهێ ئاشتی بو بەلاڤکرنێ، دهۆک: ١٩٩٩.
١٢- دراسات فی تاریخ الکورد، ترجمە ترزە فائق الجاف، منشورات رابطە کاوا، بیروت: ١٩٩٩.
١٣- جوایەز، بەرهەمی نۆ شاعیری هەولێری ( کۆمەڵە شیعری هاوبەش)، دەزگای ئاراس، هەولێر: ١٩٩٩.

١٤- پەتاتەخۆرەکان، کۆمەڵە چیرۆک، بڵاوکراوەکانی ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی، هەولێر: ٢٠٠٠.